## کورتەیەک دەربارەی نووسەر :

ناوی ئەم پێشەوایە الحسن بن علي بن خلف البربهاري یە، لە ساڵی (٢٥٢) کۆچی لەدایک بووە، وا دەردەکەوێت لە شاری بەغدا لەدایک بووبێ و هەر لەوێش ژیاوە .

## مامۆستاکانی :

تەلەبەی کۆمەڵێک قوتابیانی ئیمامی احمد بووە، لەوانە :

١ - احمد بن محمد بن الحجاج بن عبدالعزيز ابو بكر المروذي.

٢ - سهل بن عبدالله بن يونس بن عيسى ابو محمد التستري .

## قوتابیەکانی :

١ - الحسين بن عبدالله أبو علي النجاد.

٢ - عبدالعزيز بن جعفر بن أحمد بن يزداد أبو بكر ناسراوە بە غلام الخلال .

٣ - عبيدالله بن محمد بن بطة أبو عبدالله العبكري ناسراوه به ابن بطة كه يەكێكە لە زانا بەناوبانگەکان لە ساڵی (٣٨٧ ه) کۆچی دوایی کردووه .

٤ - محمد بن احمد بن اسماعيل ابو الحسن ناسراوه به ابن سمعون، زانا و ئامۆژگاریکار لەساڵی(٣٨٧ ه) کۆچی دوایی کردووه.

٥ - محمد بن محمد بن عثمان ابو بكر المغربي .

ئەم ئیمامە بەڕێزە تووشی زۆر ناڕەحەتی و مەینەتی بووە لەلایەن سوڵتان و قسەی بیدعەچیەکانەوە بۆیە ناچار دەبوو کە خۆی بشارێتەوە لە دەستیان بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئیمام هەرگیز کۆڵی نەدەدا و بەرامبەریان دەوەستاوە ئەوانیش بەردەوام لە دژی ئیمام پیلانیان دەگێڕا، بۆیە ئەم ئیمامە بەڕێزە کاتێکیش کە کۆچی دوایی کرد هەر بەشاراوەیی کۆچی دوایی کرد الله تعالى لێی خۆش بێت و بەبەهەشتی شاد بکات .

ئەمە تەنیا کورتەیەکە لە ژیانی ئەم ئیمامە ئەگینا چەندێک باسی کێشە و میحنەتەکانی بکەین ئەوا تەواو نابێت.

## ئیمام البربهاري رحمه الله دەڵێت :

الحمدُ لله الذي هَدَانَا للإسْلامِ، وَمَنَّ عَلَيْنَا بِهِ، وأخرجَنَا فِي خَيْرِ أُمَّةٍ، فنسألُهُ التوفيق لِمَا يُحِبُّ وَيَرْضَى، والحفظَ مِمَّا يَكَرَهُ وَيَسْخَطُ .

سوپاس و ستایش بۆ الله كە ڕێنموونیی كردووین بۆ ئیسلام، وە بەو ئیسلامە منەتی خۆی ڕژاندووە بەسەرمان، لە باشترین ئوممەت دەریچواندووین، بۆیە داوای لێ دەكەین كە تەوفیقمان بدات بۆ ئەوەی كە پێی خۆشە [خۆشی دەوێت] و پێی ڕازییە، بمانپارێزێ لەوەی پێی ناخۆشە [خۆشی ناوێت] و پێی تورە دەبێ.

١ - اعْلَمُوا أَنَّ الإسلامَ هُوَ السُّنَّةُ، وَالسُّنَّةَ هِيَ الإِسْلامُ، ولا يَقُومُ أحدُهُمَا إِلَّا بالآخر .

١ - بزانن ئیسلام بریتییە لە سوننەت، وە سوننەتیش بریتییە لە ئیسلام، هیچ یەكێكیان بێ ئەوی تر ڕاست و دروست نییە .

٢ - فَمِن السُّنَّةِ لُزُومُ الجَمَاعَةِ، فَمَن رَغِبَ غَيْرَ الجَمَاعَةِ وفَارَقَهَا فَقَد خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلامِ مِن عُنُقِهِ، وَكَان ضالًا مُضِلًّا .

٢ - پابەندبوون بە جەماعەتەوە لە سوننەتە، جا هەرکەسێ حەزی لە غەیری جەماعەت بێت و لێی جیاببێتەوە، ئەوا گرێی ئیسلامی لە ملی خۆی داماڵیوە و کەسێکی گومڕا و گومڕاکەرە .

---

**: و اتە بێجگە لەوەی خۆی گومڕایە خەڵکیش گومڕا دەکات چونکە شوێنی غەیری جەماعەت کەوتووە و لێیان جیابۆتەوە .**

**جەماعەت درووست نابێت بە دوو مەرج نەبێت :**

**یەکەم : دەبێت بەرنامەیان قورئان و سوننەت بێت بە تێگەیشتنی سەلەفی ئوممەت.**

**دووەم : دەبێ پێشەو ایەکی مسوڵمانی هەبێت سەرکردایەتی بکات و بگەڕێنەوە بۆ لای .**

**لە ئەثەری دو اتردا ئیمام رحمە الله وشەی جەماعەت ڕوون ئەکاتەوە .**

٣ - وَالأَساسُ الَذي تُبْنَى عَلَيْهِ الجَماعةُ هُم أَصحابُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَرَحِمَهُم الله أَجمَعين، وَهُم أهلُ السُّنَّةِ وَالجَماعَةِ، فَمَن لَمْ يَأْخُذْ عَنْهُمْ فَقَدْ ضَلَّ وَابْتَدَعَ، وَكُل بِدعَةٍ ضَلالَة، وَالضَلالَةُ وَأهلُها فِي النَّارِ .

٣ - ئەو بنەمایەی کە جەماعەتی لەسەر بنیات دەنرێت بریتییە لە : هاوەڵانی محمد ﷺ، ڕەحمەتی الله یان لێبێت، ئەوان ئەهلی سوننەت و جەماعەتن، جا هەر کەسێک لەوانەوە وەرنەگرێت، ئەوا گومڕابووە و بیدعەی کردووە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە، گومڕایی و ئەهلەکەی لە ئاگردان .

---

**: پاشان تابیعیەکان تێگەیشتنیان بۆ قورئان و فەرموودە لە هاوەڵان وەرگرت، دوای ئەوانیش لە پێش خۆیانیان وەرگرت، بەم شێوەیە ئێمەش دەبێت شوێن سەلەف بکەوین بۆ تێگەیشتنی دینەکەمان .**

**ئیمام أحمد لە (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**بنچینەی سوننەت لای ئێمە، دەست گرتنە بەوەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ لەسەری بوون، وە ئیقتیدایان پێوە بکەین - و اتە هاوەڵانی رسول الله ﷺ بکەینە پێشەنگی خۆمان - .**

٤ - وقَالَ عُمرُ بنُ الخَطَّابِ رَحِمَهُ اللّهُ : (لَا عُذْرَ لأحدٍ في ضَلَالَةٍ ركبها حَسِبَهَا هُدَى، ولا في هُدَى تَرَكَهُ حَسِبَهُ ضَلَالَةً، فقد بُيِّنَت الأمور، وثبتت الحُجَّةُ، وانْقَطَعَ العُذْرُ .

وذلك أنَّ السُّنَّةَ والجمَاعَةَ قد أحْكَمَا أَمرَ الدِّينِ كُلِّه، وتَبيَّنَ للنَّاسِ، فعلى النَّاسِ الإتباع) .

٤ - عمر بن الخطاب رحمه الله فەرموویەتی : (عوزر [بیانوو] بۆ هیچ کەسێک نییە لە گومڕاییەک کە ئەچێتە سەری [شوێنی بکەوێت] بە هیدایەتی بزانێت، وە بۆ کەسێکیش نییە کە واز لە هیدایەت بێنێت و بە گومڕایی بزانێت، چونکە هەموو کارەکان ڕوون کراوەتەوە، وە حوججەکانیش دامەزراوە، عوزر نەماوە و پچڕاوە .

چونکە ئەهلی سوننە و جەماعەت هەموو کاروباری دینەکەیان مەحکەم کردووە و بۆ خەڵکی ڕوون بووەتەوە، لەسەر خەڵکیە کە شوێنی بکەون) .

---

إبن أبي زَمَنِين المَالكِي لە (أصول السنة) ئەڵێت :

(بیانوو بوونی نیە بۆ کەسێکی نەزان کە وازبهێنێت لە پرسیارکردن و گەڕان بە دوای بنەماکانی ئیمان و دین و شەریعەتەکانی موسڵمانان، لە کاتێکدا الله ﷻ ئەو کارەی لەسەر پێویست کردووە بە فەرمایشتی : ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [النحل : ٤٣] .

وە بە هەمان شێوەش بیانوو نیە بۆ زانایەك لە شاردنەوەی ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێت لەوەی کە قورئان دەربارەی هاتوەتە گۆ، یان سوننەتێکی جێگیر لە کەسێك کە نایزانێت، لەبەرئەوەی بەڵێنەی الله ﷻ وەریگرتووە لە زانایان لە فەرمایشتی : ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ﴾ [آل عمران : ١٨٧]، تەوفیقیش نیە مەگەرلای الله نەبێت، پشتم بەوبەستووە و بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە .

**٥** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أنَّ الدِّينَ إِنَّمَا جَاء مِن قِبَلِ الله تبارَكَ وَتَعَالَى لَمْ يُوضَعْ عَلى عُقُولِ الرِّجَالِ وآرائِهِم، وعِلْمُهُ عِندَ اللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِ، فَلا تَتَّبِعْ شيئًا بِهَوَاكَ، فَتَمْرُقَ مِنَ الدِّينِ فَتَخْرُجَ من الإِسلامِ؛ فَإِنَّهُ لَا حُجَّةَ لَكَ، فقد بَيَّنَ رسول الله ﷺ لأُمَتِهِ السُّنَّةَ وَأَوْضَحَهَا لأصحابِهِ وَهُمُ الجماعةُ، وهُمُ السَّوَادُ الأعْظَمُ .

وَالسَّوَادُ الأعظمُ : الحقُّ وأهلُهُ، فَمَنْ خَالَفَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي شَيْءٍ مِن أَمْرِ الدِّينِ فَقَدْ كَفَرَ .

**٥** - ڕەحمەتی الله ـت لێ بێت ئەم دینە لەلایەن الله تعالى ـەوە هاتووە، لەسەر عەقڵ و بۆچوونی مرۆڤەکان دانەنراوە و، زانستەکەی لای الله و پێغەمبەرەکەیەتی، بۆیە شوێنی هیچ شتێك مەکەوە بە حەز و ئارەزووی خۆت لە ئاین یاخی ببیت و لە ئیسلام دەرچیت، چونکە هیچ حوججەیەکت نییە، پێغەمبەری الله ﷺ سوننەتی بۆ ئوممەتەکەی ڕوونکردووەتەوە و بۆ هاوەڵانی ڕوونکردوەتەوە، ئەوانیش جەماعەتن ئەوانیش زۆربەی خەڵکن .

زۆربەی خەڵك : بریتییە لە حەق و ئەهلی حەق، هەر کەسێك پێچەوانەی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ بکات لە شتێکدا لە کاروباری ئەم دینە ئەوا کافر بووە .

---

**: مەبەست لە [السواد الاعظم] تەنها زۆرینە نییە بەڵکو ئەوانەی لەسەر حەقن هەرچەندە کەمیش بن .**

**ئیمام أحمد لە (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**(وە لە سونەنتدا قیاس نیە، وە نمونەی خراپ بۆ سوننەت ناهێنرێتەوە، دەبێت سوننەت لە زانایانی سەلەف وەربگیرێت، نابێت بەپێی عەقڵ و هەوا و ئارەزووی خۆت درکی پێ بکەیت، سوننەت ئەوەیە کە شوێن کەوتەبیت و وازبێنیت لە هەوا و ئارەزوو) .**

٦ - وَاعْلَمْ أَنَّ الناسَ لَمْ يبتدِعُوا بِدعةٌ قَطُّ حتى تَرَكُوا مِنَ السُّنَّةِ مِثْلَهَا، فَاحْذَرِ الْمُحَدّثاتِ مِنَ الأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثة بدعةٌ، وكُلَّ بِدعةِ ضلالةٌ، والضَّلالةُ وأهلُهَا فِي النَّارِ .

٦ - بزانە خەڵکی هەرگیز هیچ بیدعەیەکیان دانەهێناوە تاوەکو سوننەتێکیان وەکو ئەوە بەجێ نەهێشتبێت **[واتە کاتێ بیدعەیەکیان کردووە ئەوا بەئەندازەی ئەوە سوننەت ون دەکەن چونکە هەرگیز بیدعە و سوننەت کۆنابنەوە هەریەکیان ئەویتر دەر دەکات بۆیە نابێت مسوڵمان لە هەمان کاتدا سونی و بیدعەچی بێت بەڵکو یان دەبێ بیدعەچی بێ یان دەبێ سونی بێ ئەمەش لە زیانەکانی بیدعەیە]**، بۆیە ئاگاداری حەرامکراوەکان بە لە دینەکەتدا، چونکە هەموو داهێنراوێک بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕایە و هەموو گومڕایەکیش لە ئاگردایە .

٧ - واحْذَرْ صِغَارَ الْمُحْدَثَاتِ مِنَ الأُمُورِ، فَإِنَّ صِغَارَ البِدَعِ تَعُودُ حَتى تَصِيرَ كبارًا، وكذلكَ كُلُّ بِدعةٍ أُحْدِثَتْ فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ كَانَ أَوَّلُهَا صَغِيرًا يُشْبِهُ الحَقّ، فاغْتَرَ بذَلكَ مَنْ دَخَلَ فِيهَا، ثُمَّ لَمْ يَسْتَطِعْ الخَرُوجَ مِنْهَا، فَعَظُمَتْ وَصَارَتْ دِينًا يُدَانُ بِهَا فَخَالَفَ الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ فَخَرَجَ مِنَ الإِسْلَامِ.

٧ - ئاگاداری شته تازه داهێنراوه بچووكه‌كان به، چونكه [خەڵكی لەسەر] بیدعه بچووكه‌كان ڕادێن تاوه‌كو گه‌وره ئه‌بێت، هه‌روه‌ها هه‌موو بیدعه‌یه‌ك له‌م ئوممه‌ته‌دا داهێنراوه له‌سه‌ره‌تاوه بچووك بووه و له حه‌ق ئه‌چێت، ئه‌وه‌ی تووشی ده‌بێت پێی هه‌ڵده‌خه‌ڵه‌تێت ئینجا ناتوانێت لێی ده‌ربازبێت، وه پاشان گه‌وره ده‌بێت و ده‌بێت دینێك و خه‌ڵكی دینداری پێوه ده‌كه‌ن، پێچه‌وانه‌ی ڕێگا ڕاسته‌كه كرد هه‌ربۆیه له ئیسلام ده‌رچوو.

---

**: هه‌موو بیدعه‌كان كه له سه‌ره‌تاوه دروست بوون یه‌كه‌مجار بچووك بوون، به‌ڵام به تێپه‌ڕبوونی كات گه‌وره بوون و سنووری بیدعه‌یه‌تیان تێپه‌ڕاند و بوون به كوفر، وه‌ك بیدعه‌ی ڕافیضه‌كان، یه‌كه‌مجار ته‌نها له پێشخستنی علي به‌سه‌ر عثمان دا رضي الله عنهم ده‌ستی پێ كرد، به‌ڵام دواتر روای لێهات ئیمامی علي رضي الله عنه یان بردووه‌ته ئاستی الله تعالى و تایبه‌تمه‌ندیه‌كانیان پێداوه والعیاذ بالله.**

**وه ئه‌گه‌ر وازله بیدعه بهێنیت و بڵێیت بیدعه‌یه‌كی بچووكه ئه‌وا ده‌بێته دین و خه‌ڵكی دینداری پێوه ده‌كه‌ن ئه‌گه‌رچی بیدعه‌كه بچووكیش بێت، چونكه هه‌ر بیدعه‌ی بچووك بووه به‌ره‌و بیدعه‌ی گه‌وره چووه.**

٨ - فَانْظُرْ رَحِمَكَ اللهُ كُلَّ مَن سَمِعْتَ كَلَامَهُ مِنْ أَهْلِ زَمَانِكَ خَاصَّةً فَلَا تَعْجَلَنَّ، وَلَا تَدْخُلَنَّ فِي شَيْءٍ مِنْهُ حتَّى تَسْأَلُ وَتَنْظُرَ : هَلْ تَكَلَّمَ فِيهِ أَحَدٌ مِن أَصْحَابِ النَّبِي ﷺ ورَضِي الله عَنْهُم، أَوْ أَحَدٌ مِنَ العُلَمَاءِ؟ فَإِن أَصَبْتَ فِيهِ أَثَرًا عَنْهُم فَتَمَسَّكْ بِهِ، وَلا تُجَاوِزْهُ لِشَيْءٍ، وَلَا تَخْتَرْ عَلَيْهِ شَيْئًا فَتَسْقُطَ فِي النَّارِ .

٨ - تەماشەکە ڕەحمەتی اللّٰه تعالی ت لێ بێت، ئەگەر گوێت لە قسەی هەر کەسێک بوو بە تایبەتی لەو سەردەمەی تۆی تێدای ئەوا هەرگیز پەلە مەکە و مەچۆ ناو هیچ مەسەلەیەکەوە تاکو تەماشا نەکەیت و پرسیار نەکەیت ئایە هیچ کەسێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قسەیان کردووە؟ یان یەکێک لە زانایان؟ جا ئەگەر لەوانەوە شتێکت دەستکەوت ئەوا دەستی پێوە بگرە لەبەر هیچ شتێک وازی لێ مەهێنە، هیچ شتێک هەڵمەبژێرە بەسەریداو بکەویتە ناو ئاگرەوە .

---

: واتە تاوەکو نەگەڕێینەوە بۆوتەکانی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ یاخود یەکێک لە زانایان کە شوێنکەوتەی بەرنامەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بێت، نابێت بڕیار لەسەر مەسەلەیەک بدەین چونکە ئەوان ئەم دینەیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە و هاوەڵانیش لە پێغەمبەری اللە ﷺ ڕیو ایەتیان کردووە .

وە گەردەپرسی نازانم کێ حەقە وکام ووتەیە حەقە، هەرکەسە وگروپێک قسەیەک دەکەن، ئەوا ئیمام بەربەهاری مەنهەجی بۆ داناویت کە شوێنی کام ووتە دەکەویت و بە چ پێوەرێک ووتەی خەڵکی دەپێویت تاکو بزانیت حەقە یان ناحەق .

٩ - وَاعْلَمْ أَنَّ الخُرُوجَ عَنِ الطَّرِيقِ عَلَى وَجْهَيْنِ :

أَمَّا أَحَدُهُمَا : فَرَجُلٌ قَدْ زَلَّ عَنِ الطَّرِيقِ، وَهُوَ لا يُرِيدُ إِلَّا الْخَيْرِ ، فَلَا يُقْتَدَى بِزَلَّتِهِ فَإِنَّهُ هَالِكٌ .

وَالآخَرُ عَانَدَ الْحَقَّ وَخَالَفَ مَنْ كَانَ قَبْلَهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ؛ فَهُوَ ضَالٌ مُضِلٌ، شَيْطَان مَرِيدٌ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ، حَقِيقٌ عَلَى مَن عَرَفَهُ أَنْ يُحَذِّرَ النَّاسَ مِنْهُ، وَيُبَيِّنَ لِلنَّاسِ قِصَّتَهُ، لِئلَّا يَقَعَ فِي بِدْعَتِهِ أَحَدٌ فَيَهْلِكَ .

٩ - وە بزانە دەرچوون لە ڕێگای ڕاست بە دوو شێوەیە :

یەکێکیان پیاوێکە لە ڕێگاکە هەڵخلیسکاوە لە کاتێکدا ئەو تەنها خێر و چاکەی دەوێت، بۆیە ناکرێتە پێشەنگ لە خلیسکانەکەی چونکە ئەوە بەهەلاکەتدا چووە .

وە پیاوێک بەرهەڵستی لەگەڵ حەقدا دەکات و لەگەڵ لە اللّٰه ترساوانی پێش خۆی ناکۆکە ئەوە گومڕایەکی گومڕاکەرە شەیتانێکی سەرکەشی یاخییە لەم ئوممەتەدا پێویستە لەسەر هەر کەسێک ناسییەوە خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە و خەڵکی لە بابەتەکەی ئاگادار بکاتەوە بۆ ئەوەی هیچ کەسێک نەکەوێتە بیدعەکەیەوە و بەهیلاکدا بچێت .

---

**: مەبەست لە پیاوی یەکەم ئەوەیە : کە ئەو نیەتی باشە و مەبەستی چاککردنی خەڵکیە بەڵام ڕێگای ڕاستی نەگرتوەتە بەر، ئەمە بە کەسێکی هەڵەکار دەژمێردرێت،**

**بۆیە هەرکەسێ نیەتی چاکە بێت دەبێت لەسەر ڕێگای ڕاست بێت ڕێگای ڕاستیش وەک الله دەفەرموویێت : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [الأنعام : ١٥٣]، ئەمە حاڵی زۆربەی ئەو کەسانەیە کە لەخۆیانەوە شت دادەهێنن لە دیندا، بۆیە ئەم کارە درووست نییە و خاوەنەکەی لەسەر ڕێگای ڕاست نییە با هەرنیەتیشی چاک بێت.**

**وە مەبەست لە پیاوی دووەم ئەوەیە : کە ئەو نیەتی باش نییە بەڵکو دەیەوێت خەڵکی بەرەو گومڕایی ببات لە هەمان کاتدا حەق دەناسێت و دەزانێت ئەوەی بۆ دەرچووە کە خۆی ناحەقە بەڵام بە ئەنقەست لەسەر ڕێگای حەق دەردەچێت و مەبەستی گومڕاکردنی خەڵکە .**

١٠ - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أَنَّهُ لا يَتِمُّ إِسْلَامُ عَبْدٍ حَتَّى يَكُون مُتَّبَعًا مُصَدِّقًا مُسَلَّمًا، فَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ قَدْ بَقِي شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ الإِسْلَامِ لَمْ يَكْفِنَاهُ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَدْ كَذَّبَهُمْ، وَكَفَى بِهَذَا فُرْقَةٌ وَطَعْنَا عَلَيْهِمْ، فَهُوَ مُبْتَدِعٌ ضَالٌ مُضِلٌ، مُحْدِثٌ فِي الإِسْلامِ مَا لَيْسَ مِنْهُ .

١٠ - بزانە ڕەحمەتی الله تعالی ـت لێ بێت ئیسلامی بەندەیەک تەواو نابێت تاوەکو شوێنکەوتە و بەڕاستزان و تەسلیم نەبێت، هەر کەسێک وا بزانێت دەربارەی ئیسلام شتێک ماوە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەیانگەیاندووە ئەوا ئەوانی بەدرۆ خستووەتەوە، بەسە بۆ ئەو قسەیە ناکۆکبوون و تانەدان

لەوان، ئەوە کەسێکی بیدعەکاری گومڕای گومڕاکەرە شتی تازەی لە ئیسلامدا داهێناوە کە تێیدانەبووە .

---

**: پێناسەی ئیسلام بریتیە لە : هو الإستسلام لله بالتّوحيد و اته : تۆ تەسلیمی الله بیت، بە تاکو تەنهایی ئەو بپەرستیت و ملکەچی بکەیت، تا تەسلیم نەبیت ئیسلامەتیەکەت تەواو نابێت، وە نابێت بڵێیت کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەموو شتێکیان نەگەیاندووە چونکە ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەوانت بەدرۆ خستۆتەوە ئەمەش گومڕای گومڕاکەرە و بیدعەیە .**

**- مالک بن أنس رحمه الله لە (الإبانة الكبرى) ئەڵێت :**

**(وە هەرکەسێک بیدعەیەک داهێنێت لە ئیسلامدا و بە باشی بزانێت ئەوە وتوویەتی کە محمد ﷺ خیانەتی لە پەیامەکەی کردووە، چونکە الله ئەفەرمووێت : | ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ | (المَائـِدَة : ٣) .**

**جا ئەوەی ئەورۆژە دین نەبووبێت ئەمڕۆش دین نییە) .**

**١١** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أَنَّهُ لَيْسَ فِي السُّنَّةِ قِيَاسُ، وَلَا تُضْرَبُ لَهَا الأَمْثَالُ، وَلا تُتَّبَعُ فِيهَا الْأَهْوَاءُ، بَلْ هُوَ التَّصْدِيقُ بِآثَارِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِلَا كَيْفٍ وَلَا شَرْحٍ، وَلَا يُقَالُ : لِمَ؟ وَلَا كَيْفَ؟

**١١** - وە بزانە ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێبێت هیچ قیاسێک لە سوننەتدا نییە [سوننەت لێرەدا مەبەستی عەقیدەیە]، نموونەشی بۆ ناهێنرێتەوە و شوێنی

ئارەزووەکان ناکەوین، بەڵکو تەنها باوەڕکردن و بەڕاست و زانینی شوێنەواری [فەرموودەکانی] پێغەمبەری اللّٰه یە ﷺ، بەبێ چۆنیەتی و بەبێ ڕاڤە، هەرگیز ناگوترێت : بۆ؟ چۆن؟

**١٢** - وَالكَلَامُ وَالْخُصُومَةُ وَالْجِدَالُ وَالْمِرَاءُ مُحْدَثُ، يَقْدَحُ الشَّكَ فِي القَلْبِ، وَإِنْ أَصَابَ صَاحِبُهُ الْحَقِّ وَالسُّنَّةَ .

**١٢** - وە الکلام، ناکۆکی و بەربەرەکانێ، دەمە دەمێ، مشت و مڕ، هەموو داهێنراون گومان دەخەنە دڵەوە، هەرچەندە خاوەنەکەی حەق و سوننەت بپێکێ .

---

**: مەبەستی ئەوەیە هەر چەندیش لە جیدالەکەت بپێکێ ئەوا هەڵەی کردووە، چونکە ڕێگای ڕاست بریتییە لە تەسلیم بوون و نەچوونە ناو جیدال کە ڕق و کینە درووست دەکات .**

**١٣** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أَنَّ الكَلَامَ فِي الرَّبِّ تَعَالَى مُحْدَثْ، وَهُوَ بِدْعَةٌ وَضَلَالَةٌ، وَلا يُتكَلَّمُ فِي الرَّبِّ إِلَّا بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ عز وجل فِي القُرْآنِ، وَمَا بَيَّنَ رَسُولُ الله ﷺ لأَصْحَابِهِ، فَهُوَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ وَاحِدٌ : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ (الشورى : ١١) .

**١٣** - وه بزانه ڕەحمەتی اللّٰه ـت لێبێت كه وا قسەكردن دەربارەی پەروەردگار باسێكی نوێیە، ئەویش داهێنراو و گومڕاییە، نابێت دەربارەی پەروەردگار قسە بكرێت ئیللا بەو شێوە نەبێت خۆی وەصفی خۆی كردووە لە قورئاندا و پێغەمبەری اللّٰه ﷺ بۆ هاوەڵانی ڕوونی كردوەتەوە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو تاك تەنهایە : | **لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ** | **(الشورى : ١١)**.

واتە : هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە وە هیچ شتێك لەو ناچێت و هەر ئەویش بیسەر و بینایە .

---

**: ئەم بابەتە زۆر گرینگە چونكە زۆربەی گرووپە گومڕاكان لەم جۆرەی تەوحید كە الأسماء الصفات ە تێكەوتن، ئەمەش بەهۆی خستنەپێشی عەقڵی پووچیان بەسەر قورئان و سوننەتدا، نەهاتن لەڕێگەی قورئان و فەرمووده بە تێگەیشتنی سەلەف اللّٰه تعالی بناسن، بەڵكو هاتن بەپێی هەندێك یاسای كەلامی خو ایەكیان بۆ خۆیان داتاشی .**

**١٤** - رَبُّنَا أَوَّلُ بِلَا مَتَى، وَآخِرٌ بِلَا مُنْتَهَى، يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى وَهُوَ عَلَى عَرْشِهِ اسْتَوَى، وَعِلْمُهُ بِكُلِّ مَكَانٍ، وَلَا يَخْلُو مِنْ عِلْمِهِ مَكَانٌ، وَلَا يَقُولُ فِي صِفَاتِ الرَّبِّ تَعَالَى : كَيْفَ؟ وَلِمَ؟ إِلَّا شَاكٌّ فِي اللَّه تَبَارَكَ وَتَعَالَى .

**١٤** - پەروەردگارمان یەکەمینە، بەبێ کەی؟ دوایینە بەبێ کۆتایی، **[واتە یەکەمینە بەبێ سەرەتا ودوایینە بەبێ کۆتایی ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ﴾]**، نهێنی و شاراوەتریش ئەزانێت، ئەو بەرزبووەتەوە بۆسەر عەرشەکەی خۆی و عیلمەکەی لە هەموو شوێنێکە و هیچ جێگایەک نییە لە عیلمی بەتاڵ بێت **[لێرەدا پێویستە شتێکی گرینگ بزانین ئەویش ئەوەیە : کە الله لە هەموو شوێنێکە بە علمی نەک زاتی خۆی، چونکە بە زاتی لەسەر عەرشە ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾، بەشێک لە خەڵکی دەڵێن الله لە هەموو شوێنێکە، ئەمە کوفرە، بەڵکو الله بە علمی لە هەموو شوێنێکە نەک زاتی الله، واتە هیچ شتێک نییە الله تعالى نەیزانێت و ئاگای لێ نەبێت، ئەمە سەلەف لە کتێبەکانیاندا زۆرباسیان کردووە]** .

وە هیچ کەسێک دەربارەی سیفاتی الله ناڵێت : چۆن؟ ئیللا کەسێکی بەگومان نەبێت لە الله تبارک وتعالى **[نابێ لە هۆکارەکەی وچۆنیەتەکەی پرسیت کە بۆچی ئاوای فەرمووە تەنیا دەبێت تەسلیم بیت، چونکە تەنیا الله دەزانێت لە چۆنیەتی وهۆکارەکان ئێمەی مرۆڤ نازانین سیفەتەکانی الله تعالى چۆنە]** .

**١٥** - وَالقُرْآنُ كَلَامُ اللَّه وَتَنْزِيلُهُ وَنُورُهُ، وَلَيْسَ مَخْلُوقًا، لأَنَّ القُرْآنَ مِنَ اللَّه، وَمَا كَانَ مِنَ اللَّه فَلَيْسَ بِمَخْلُوقٍ، وَهَكَذَا قَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَأَحْمَدُ بنُ حَنْبَلٍ رَحِمَهُمُ اللَّهُ وَمِن قَبْلِهِمَا مِنَ الفُقَهَاءِ وَمَن بَعْدَهُمَا وَالْمِرَاءُ فِيهِ كُفْرٌ.

**١٥** - قورئان کەلامی الله یە لەلایەن ئەوەوە دابەزیوە و نوور و ڕووناکی ئەوە، دروستکراو نییە، چونکە قورئان لەلایەن الله ەوە هاتووە، هەر شتێک

لەلایەن اللّٰه ـەوە هاتبێت دروستكراو نییە، مالیك ی كوڕی ئەنەس و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ڕەحمەتی اللّٰه یان لێ بێ، وە ئەوانەی پێش ئەوان و ئەوانەی پاش ئەوان هاتوون لە فەقیهەكان وایان گوتووە، مشت و مڕ كردن تێیدا كوفرە .

---

**ئیمام أحمد لە (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**قورئان كەلامی اللّٰه یە وە مەخلوق نیە، وە نابێت لاواز بیت لەوەی بڵێیت مخلوق نییە، لەبەرئەوەی سیفەتی كەلام ی اللّٰه تعالی لە اللّٰه جیانیە، وە هیچ شتێكی ئەویش مخلوق نییە .**

**١٦** - وَالْإِيْمَانُ بِالرُّؤْيَةِ يَوْمَ القِيَامَةِ، يَرَوْنَ اللَّهَ وَبِأَبصارِ رُءُوسِهِم وَهُوَ يُحَاسِبُهُم بِلَا حَاجِبٍ وَلَا تَرْجُمَانٍ .

**١٦** - وە باوەڕ بوون بە بینینی اللّٰه تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا [**بۆیە دەفەرمووێت لە قیامەت چونكە اللّٰه لەدونیادا نابینرێت**] اللّٰه تعالی دەبینن بەچاوی سەریان [**ئەمە بۆ ئەوەیە كە نەفی تەحریفی ئەو كەسانە بكات كە دەڵێن : اللّٰه دەبینن بە دڵیان نەك بە چاویان**]، ئەویش لێپێچینەوەی لەگەڵیاندا دەكات بەبێ پەردە و بەبێ وەرگێڕ.

---

**ئیمام أحمد لە (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**ئيمان هێنان به بينينى الله تعالى له ڕۆژى دواى، هەروەك هاتووه وه گێڕدراوەتەوه له پێغەمبەرﷺ له حەديث ە صحيح ەكان .**

**١٧** - وَالإِيْمَانُ بِالْمِيْزَانِ يَوْمَ القِيَامَةِ، يُوزَنُ فِيهِ الْخَيْرُ وَالشَّرُّ، لَهُ كِفَّتَانِ وَلَهُ لِسَانٌ .

**١٧** - وه باوەڕهێنان به تەرازوو له ڕۆژى قيامەتدا كه چاكه و خراپەى پێ دەپێورێت، دوو تا و زمانێكى هەيه .

---

**ئيمام أحمد له (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**وه ئيمان هێنان به تەرازوو له ڕۆژى قيامەتدا هەروەك هاتووه، تەرازوو پێوانەى بەنده دەكات هێنده باڵه مێشوولەيەک قورس نييه، - مەبەستى ئەوەيه بەندەى واهەيه پێوانه دەكرێت ناگاته هێندەى باڵه مێشولەيەك - ، پێوانەى كردەوەكانى بەندەكان دەكرێت هەروەك هاتووه له ئاثار، دەبێت باوەڕى پێ بهێنرێت وه بەڕاستى بزانيت، وه پشت لەوه بكەيت كه ئەمه ڕەت دەكاتەوه، وه وازبهێنيت له موجادەلەكردن و موناقشەكردن لەگەڵى .**

**١٨** - وَالإِيْمَانُ بِعَذَابِ القَبْرِ، وَمُنْكَرٍ وَنَكِيرٍ .

**١٨** - وه باوەڕهێنان به سزاى ناوگۆڕ، وه مونكەڕ و نەكير.

ئيمام أحمد له (أصول السنة) دا ئه‌ڵێت :

ئيمان بوون به سزاى گۆڕ، ئه‌و ئوممه‌ته تاقيده‌كرێنه‌وه له گۆڕه‌كانيان وه پرسياريان لێده‌كرێت، ده‌رباره‌ى ئيمان و ئيسلام؟ وه كێ په‌روه‌ردگاريه‌تى؟ وه‌كێ پێغه‌مبه‌ريه‌تى؟

وه دوو فريشته دێنه لايان چۆن الله تعالى بيه‌وێ، وه چۆن ويستى لێبێت عزوجل ئاوا تاقيان ده‌كاته‌وه، وه ده‌بێت باوه‌ڕت پێى هه‌بێت وه به‌ڕاستى بزانيت .

**١٩** - وَالإِيْمَانُ بِحَوْضِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلِكُلِّ نَبِيٍّ حَوْضُ، إِلَّا صَالِحًا عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلامُ فَإِنَّ حَوْضَهُ ضَرْعُ نَاقَتِهِ .

**١٩** - وه باوه‌ڕهێنان به حه‌وزه‌كه‌ى پێغه‌مبه‌رى الله ﷺ، وه هه‌موو پێغه‌مبه‌رێك حه‌وزێكى هه‌يه ته‌نها [صالح عليه السلام] نه‌بێت چونكه حه‌وزه‌كه‌ى ئه‌و گوانى حوشتره‌كه‌ى بوو .

ئيمام أحمد له (أصول السنة) دا ئه‌ڵێت :

ئيمان هێنان به حه‌وض، رسول الله ﷺ حه‌وض ێكى هه‌يه كه له ڕۆژى قيامه‌ت ئوممه‌ته‌كه‌ى له‌سه‌رى كۆده‌بنه‌وه، پانتايه‌كه‌ى وه‌كو درێژيه‌كه‌يه‌تى، كه مه‌سافه‌كه‌ى به‌قه‌د مانگێكه، ژماره‌ى كوپه‌كانى كه ئاوه‌كه‌ى پێ ده‌خورێته‌وه به‌قه‌د

**ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، لەسەر ئەو هەواڵ و ئاثارانەی کە بە صحیحی لەسەری هاتوون.**

**٢٠** - وَالإيْمَانُ بِشَفَاعَةِ رَسُولِ الله ﷺ لِلْمُذْنِبِيْنَ الْخَاطِئِينَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَعَلَى الصِّرَاطِ، وَيُخْرِجُهُمْ مِنْ جَوْفِ جَهَنَّمَ، وَمَا مِن نَبِي إِلَّا وَلَهُ شَفَاعَةٌ، وَكَذَلِكَ الصِّدِّيقُونَ وَالشُّهَدَاءُ والصَّالِحُونَ، وَللَّهِ بَعْدَ ذَلِكَ تَفضُّلٌ كَثِيرٌ فيمَن يَشَاءُ، والْخُرُوجُ مِن النَّارِ بَعْدَمَا احْتَرَقُوا وَصَارُوا فَحْمًا.

**٢٠** - وە باوەڕهێنان بە شەفاعەتی پێغەمبەری اللە ﷺ بۆ تاوانبارە هەڵەکارەکان لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر سیڕات و لە ناوەڕاستی جەهەننەم دەردەکرێن، هیچ پێغەمبەرێك نییە ئیللا شەفاعەتی خۆی هەیە، هەروەها صدیق ەکان و شەهیدەکان و پیاوچاکان، اللّٰە تعالی لە پاش ئەوە فەزڵێکی زۆری هەیە بۆ هەر کەسێک خۆی بیەوێ، هەروەها دەرچوون لە ئاگر لە پاش ئەوەی سوتان و بوون بە خەڵوز .

---

**مەرجەکانی شەفاعەت :**

**١ - ئەبێت اللە ئیزنی پێبدات شەفاعەت بکات .**

**٢ - ئەوەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت دەبێ لە ئەهلی ئیمان بێت و مسوڵمان بێت .**

**٣ - الله لەو کەسە ڕازی بێت کە شەفاعەت دەکات وە لەو کەسەی کە شەفاعەتی بۆدەکرێت .**

**شەفاعەت دەکرێت بۆتاوانە گەورەکان جا بەوەی نەچنە ئاگری دۆزەخەوە یان لێی دەرچن گەرچوونە ئاگرەکەوە .**

**ئیمام أحمد لە (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**ئیمان بە شەفاعەتی رسول الله ﷺ، ئەم شەفاعەتە بۆ کۆمەڵانێك دەکات کە دەخرێنە ناو دۆزەخ و دەبنە خەڵوزو و دەسوتێنرێن، پاشان دەهێنرێنە دەرەوە بەهۆی شەفاعەتی رسول الله بۆیان ﷺ، ئەمریان پێ دەکرێت کە بهێنرێنە دەرەوە لەسەرڕووبارێك لەلای دەرگای بەهەشت هەروەکو لە حەدیث هاتووە، وە هەرچۆنێك الله جل شأنە بیەوێت بەویستی لێبێت وادەبێت، دەبێت ئیمانمان پێی هەبێت و بەڕاستی بزانین .**

**٢١** - وَالإِيْمَانُ بِالصِّرَاطِ عَلَى جَهَنَّمَ، يَأْخُذُ الصِّرَاطُ مَن شَاءَ اللَّهُ، وَيَجُوزُ مَن شَاءَ اللَّهُ، وَيَسْقُطُ فِي جَهَنَّمَ مَن شَاءَ اللَّهُ، وَلَهُمْ أَنْوَارٌ عَلَى قَدْرِ إِيْمَانِهِمْ .

**٢١** - وە باوەڕهێنان بە [پردی] صیراط لەسەر دۆزەخ، هەر کەسێك الله تعالى بیەوێت بە صیراط دەیبات [واتە دەیخاتە جەهەننەم] و ویستی لە کێ بێت تێدەپەڕێت، هەر کەسێك الله تعالى بیەوێ دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە، ڕوناکییان هەیە هەر کەسەو بەپێی ئیمانەکەی .

**٢٢** - وَالْإِيْمَانُ بِالْأَنْبِيَاءِ وَالْمَلَائِكَةِ .

**٢٢** - وه باوەڕهێنان به پێغەمبەران و فریشتەکان .

**٢٣** - وَالإِيْمَانُ بِأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَالنَّارَ حَقٌّ، وَأَنَّهُمَا مَخْلُوقتَانِ، الْجَنَّةُ فِي السَّمَاءِ السَّابِعَةِ، وَسَقْفُهَا الْعَرْشُ، وَالنَّارُ تَحْتَ الْأَرْضِ السَّابِعَةِ السُّفْلَى، وَهُمَا مَخْلُوقَتَانِ، قَدْ عَلِمَ اللهُ تَعَالَى عَدَدَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَمَنْ يَدْخُلُهَا، وَعَدَدَ أَهْلِ النَّارِ وَمَنْ يَدْخُلُهَا لا تَفْنَيَانِ أَبَدًا، بَقَاؤُهُمَا مَعَ بَقَاءِ اللَّهِ أَبَدَ الْآبِدِينَ فِي دَهْرَ الدَّاهِرِينَ .

**٢٣** - وه باوەڕبوون بەوەی بەهەشت ڕاستە و ئاگر ڕاستە، هەردووکیان ئێستا دروستکراون، بەهەشت لە ئاسمانی حەوتەمە و سەقفەکەی عەرشی پەروەدگارە، ئاگریش لە ژێرەوەی حەوت چینی زەوییە، هەردووکیان دروستکراون، اللّٰه تعالى ژمارەی ئەهلی بەهەشت دەزانێ، وە ژمارەی ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە، ژمارەی ئەهلی ئاگر و ژمارەی ئەوانەی دەچنە ئاگرەوە دەزانێ، هەرگیز لەناو ناچن و مانەوەیان هەتا هەتایە، مانەوەیان لەگەڵ اللّٰه تعالى تا هەتایە .

---

: واتە وەک چۆن مانەوەی اللّٰه کۆتایی نییە ئاواش مانەوی بەهەشت و دۆزەخ کۆتایی نییە، بەهەشت و دۆزەخ و ئەهلەکانیان بە هەتا هەتایی لەناویدا ئەمێننەوە .

ئیمام أحمد له **(أصول السنة)** دا ئەڵێت :

بەهەشت و دۆزەخ هەردووکیان دوو دروستکراون، هەروەکو چۆن رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : **(چومە بەهەشتەوە کۆشکێکم بینی)** .

یان دەفەرمووێت : **(حەوزی کەوثەرم بینی)** .

وە دەفەرمووێت : **(بینیم لەناو بەهەشت زۆرترینی ئەهلەکەیی .... ، وە بە دۆزەخ دا تێ پەڕیم بینیم ....)** .

وە هەرکەسێك پێی وابێت کە بەهەشت و دۆزەخ دروست نەکراون ئەوا قورئان و حەدیث ی رسول الله ی ﷺ بەدرۆ خستۆتەوە، وا حساب ناکەم کە وا ئەو کەسە باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ هەبێت .

**٢٤** - وَآدَمُ عليه السلام كَانَ فِي الْجَنَّةِ البَاقِيَةِ الْمَخْلُوقَةِ، فَأُخْرِجَ مِنْهَا بَعْدَمَا عَصَى اللَّهَ .

**٢٤** - وە ئادەم علیه السلام لە بەهەشتە هەتاهەتاییە دروستکراوەکە بووە، لەپاش ئەوەی سەرپێچی اللّٰه ی کرد دەرکرا .

---

**: ئەمەش ڕەددە بۆئەوگومڕایانەی ئەڵێن ئادەم علیه السلام لە بەهەشتەکەی ئاسمان نەبووە، ئەتوانن خوێنەری ئەم نامیلکەیە بن بۆزانیاری زیاتر:**

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/426

**٢٥** - وَالإِيْمَانُ بِالْمَسِيحَ الدَّجَّالِ .

**٢٥** - وه باوه‌ڕهێنان به هاتنی مه‌سیحی ده‌جال .

**:** بۆیه پێی ده‌وترێ [المسیح] به‌هۆی خێرا ڕۆیشتنی به‌سه‌ر زه‌ویدا که له‌ماوه‌یه‌کی که‌م هه‌موو جیهان ده‌کات .

وه پێی ده‌وترێ ده‌جال که له [دجل] هاتووه به مانای درۆ دێت، به‌هۆی ئه‌وه‌ی زیاده‌ڕۆیی ده‌کات له درۆ پێی ده‌وترێ دَجَّال .

ئیمام أحمد له **(أصول السنة)** دا ئه‌ڵێت :

ئیمان به‌وه‌ی که مه‌سیحی ده‌جال ده‌رده‌چێت له‌نێوان هه‌ردوو چاوی نوسراوه کافر، وه ئیمان بهێنیت به‌و حه‌دیث انه‌ی که ده‌رباره‌ی ده‌جال هاتوون .

وه ئه‌ڵێت :

عیسى بن مریم ﷺ داده‌به‌زێت و له‌به‌رده‌رگای لُد ده‌یکوژێت .

**٢٦** - وَالإِيْمَانُ بِنُزُولِ عِيسَى بْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ، يَنْزِلُ فَيَقْتُلُ الدَّجَّالَ، وَيَتَزَوَّجُ وَيُصَلِّي خَلْفَ القَائِمِ مِن آلِ مُحَمَّدٍ وَيَمُوتُ وَيَدْفِنُهُ الْمُسْلِمُونَ .

**٢٦** - وه باوه‌ڕهێنان به دابه‌زینی عیسای کوڕی مریه‌م علیه السلام، داده‌به‌زێ و ده‌جال ده‌کوژێت، ژن ده‌هێنێ و نوێژ ده‌کات له پشت

مەهدییەوە کە لە بنەماڵەی پێغەمبەری اللّٰه یە ﷺ و دەمرێت و موسڵمانان دەینێژن .

---

**: أبوعوانة الإسفرايني رحمه الله لە عەقیدەکەیدا ئەڵێت :**

**(وە عیسای کوڕی مریم علیه السلام حەقە، وە کاتێک دائەبەزێت حوکم ئەکات بە کتێبی الله، وە سوننەتی محمد، وە یەکێک لە ئوممەتی محمد ئەبێتە پێشەوایان) .**

**٢٧** - وَالإِيْمَانُ بِأَنَّ الإِيْمَانَ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، وَنِيَّةٌ وَإِصَابَةٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ، يَزِيدُ مَا شَاءَ اللهُ وَيَنقُصُ حَتَّى لا يَبْقَى مِنْهُ شَيْءٌ .

**٢٧** - وە باوەڕبوون بەوەی ئیمان وتە و کردەوە و نیەتە و پێکانە، زیاد دەکات تا اللّٰه تعالی ویستی لەسەر بێت، کەم دەکات تاکو هیچی لێ نامێنێتەوە .

**٢٨** - وَخَير هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْدَ وَفاةِ نَبِيهَا ﷺ : أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرُ، ثُمَّ عُثْمَانُ .

هَكَذَا رُوِيَ لَنَا عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ : كُنَّا نَقُولُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا : إِنَّ خَيْرَ النَّاسِ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ : أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَيَسْمَعُ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ فَلَا يُنْكِرُهُ .

**٢٨** - وه باشترین كەس لەم ئوممەتەدا پاش وەفاتی پێغەمبەرەكەی ﷺ بریتیە لە ئەبو بەكر، ئینجا عومەر، ئینجا عثمان .

بەم شێوەیە لە إبن عمر ـەوە رضي الله عنهما بۆمان گێڕدراوەتەوە دەڵێت : ئێمە دەمانگوت لە كاتێك كە پێغەمبەری الله ﷺ لە نێوماندا بوو، باشترین كەس لە دوای پێغەمبەری الله ﷺ بریتیە لە ئەبوبكر و، عمر و، عثمان ـە، پێغەمبەری الله ﷺ ئەوەی دەبیست و ئینكاری لێ نەدەكرد .

**٢٩** - ثُمَّ أَفْضَلُ النَّاسِ بَعْدَ هَؤُلَاءِ : عَلِي، وَطَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَاصِ، وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ عَامِرُ بْنُ الْجَرَّاحِ، وَكُلُّهُمْ يَصْلُحُ للخلافة .

**٢٩** - ئینجا باشترین كەس لەدوای ئەوانە بریتین لە : علي و طلحة و الزبير و سعد بن أبي وقاص و سعيد بن زيد و عبدالرحمن بن عوف و أبو عبيدة عامر بن الجراح، هەموویان شایستەی ئەوەن بكرێن بە خەلیفە .

---

بۆ دەستخستنی زانیاری زیاترلەبارەی بابەتەكەوە ئەم دوو پۆستە بخوێننەوە :

https://t.me/Huud1/621

https://t.me/Huud1/622

**٣٠** - ثُمَّ أَفْضَلُ النَّاسِ بَعْدَ هَؤُلَاءِ : أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّه، الْقَرْنُ الْأَوَّلُ الَّذِي بُعِثَ فِيهِم الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ والأَنْصَارُ، وَهُمْ مَنْ صَلَّى القِبْلَتَيْنِ .

**٣٠** - ئینجا باشترین کەس لە دوای ئەوانە بریتین لە هاوەڵانی پێغەمبەری اللّه ﷺ، سەدەی یەکەم کە پێغەمبەری اللّه ی ﷺ تیایدا ڕەوانەکرا کۆچەرە یەکەمەکان و پشتیوانانن، ئەوانەن کە نوێژیان بەرەو هەردوو قیبلەکە کرد .

---

**: (ئەوانەن کە نوێژیان بەرەو هەردوو قیبلەکە کرد)، واتە یەکەمجار نوێژیان بەرەو ڕووی مسجد الأقصى کرد، پاشان بەرەو ڕووی کەعبە .**

**٣١** - ثُمَّ أَفْضَلُ النَّاسِ بَعْدَ هَؤُلاءِ : مَن صَحِبَ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ سَنَةً، أَوْ أَقَلَّ مِن ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ، نَتَرَحَمُ عَلَيْهِم، وَنَذْكُرُ فَضْلَهُمْ، وَتَكُفُّ عَنْ زَلَتِهِ، وَلا نَذْكُرُ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلَّا بِالْخَيْرِ؛ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّه ﷺ : (إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا) .

**٣١** - ئینجا باشترین کەس لەدوای ئەوانە : هەر کەسێک هاوەڵێتی پێغەمبەری اللّه ی ﷺ کردبێ بۆ ڕۆژێک یان مانگێک یان ساڵێک یان کەمتر یان زیاتر، ڕەحمەتیان بۆ دەنێرین، باسی فەزڵیان دەکەین، واز لە باسکردنی هەڵەیان دێنین، باسی هیچ یەکێک لەوانە ناکەین ئیللا بە

چاكە نەبێت لەبەر ئەو وتەيەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ كە دەفەرمووێت : (ئەگەر باسی هاوەڵانم كرا ئێوە بێدەنگ بن) .

---

: دەبێت زمانمان بگرینەوە لە قسە وتن و تانەدان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، دەبێ بەرگریان لێ بكەین، وە دەبێ ڕەددی ئەوانە بدەینەوە كە وتەكانی ئەوان پوچەڵ دەكەنەوە یان لە ڕێزیان كەم دەكەنەوە، چونكە ئەمە دژی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جماعەیە .

لە **(الإبانة الصغرى)** هاتووە كە ایوب السختياني وتی : ابو قلابة پێی وتم : ئەی ایوب، چوارشت لە منەوە لەبەربكە :

**أ** - بە بۆچوونی خۆت دەربارەی قورئان قسە مەكە .

**ب** - وە ئاگاداری قەدەربە [و اتە موجادەلەی تێدا مەكە].

**ج** - وە ئەگەرباسی هاوەڵانی رسول الله ﷺ كرا دەمت بگرە و قسە مەكە .

**د** - وە ڕێگە مەدە بە خاوەن ئارەزووەكان كە گوێت لێیان بێت، چونكە هەرچییەكیان بوێت دەیگەیەنن بە گوێت .

**٣٢** - وَقَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ : (مَنْ نَطَقَ فِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّه ﷺ بِكَلِمَةٍ فَهُوَ صَاحِبُ هَوَى) .

**٣٢** - سفیانی کوڕی عیینه ئەڵێت : (هەر کەسێک گەر تەنها بە وشەیەکیش قسە بە هاوەڵانی رسول اللّٰه ﷺ بڵێت ئەوا شوێن هەوا و ئارەزوو کەوتووە .

---

**: واتە تەنها ئەو کەسانەی شوێن ئارەزوو کەوتون قسەیان پێ دەڵێت و تانەیان لێدەدات و دەربارەی ئەوان بە خراپی دەدوێت .**

**٣٣** - وَقَالَ النَبِيّ ﷺ : (أَصْحَابِي كالنُّجُومِ بأَيِّهِم اقْتَدَيْتُم اهْتَدَيْتُم) .

**٣٣** - وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (هاوەڵانم وەک ئەستێرە وان، هەر کامێکیان بکەنە پێشەنگی خۆتان ئەوا هیدایەتدراو ئەبن) .

**٣٤** - وَالسَّمْعُ والطَّاعَةُ للأئمةِ فِيمَا يُحِبُّ اللَّهِ وَيَرْضَى .

**٣٤** - وە گوێڕایەڵی کردنی پێشەوایان لەوەی اللّٰه تعالی پێی خۆشە و پێی ڕازییە .

---

**: واتە ئەگەر پێشەوا و دەسەڵاتدارێکی موسوڵمان فەرمانی پێ کردیت بە ئەنجامدانی کارێک کە اللّٰه تعالی پێی ڕازیە ئەوە دەبێت ئەنجامی بدەیت بەپێی توانات، وە ئەگەر فەرمانی پێ کردیت بە شتێک کە اللّٰه تعالی پێی ڕازی نییە ئەوە بە هیچ شێوەیەک گوێڕایەڵی ناکەیت .**

**٣٥** - وَمَن وَلِيَ الْخِلَافَةَ بِإِجْمَاعِ النَّاسِ عَلَيْهِ وَرِضَاهُمْ بِهِ فَهُوَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ.

**٣٥** - و هەر كەسێك خیلافەتی گرتە دەست بە كۆدەنگی و ڕازیبوونی خەڵكی ئەوە ئەمیری ئیماندارانە .

**:** مەبەست لە (خەڵكی) لێرەدا تەنها موسوڵمانانن .

**٣٦** - وَلَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَبِيتَ لَيْلَةٌ وَلَا يَرَى أَنْ لَيْسَ عَلَيْهِ إِمَاماً، بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا .

**٣٦** - وە حەڵاڵ نییە بۆ هیچ كەسێك تەنها شەوێك بمێنێتەوە و بۆچوونی وابێت پێشەوایەكی نییە، جا لە چاكەكاران بێت یان خراپەكاران .

**: ئەمەش بۆ كاتێكە كە پێشەوا و دەسەڵاتدارێكی مسوڵمان هەبێت، جا چاكەكار بێت یان خراپەكار، نەوەک عەلمانی و كافرەكانی ئەم ڕۆژگارە .**

**٣٧** - والْحَج وَالغَزْرُ مَعَ الإِمَامِ مَاضٍ، وَصَلَاةُ الْجُمْعَةِ خَلْفَهُم جَائِزَةٌ، وَيُصَلِّي بَعْدَهَا سِتْ رَكَعَاتٍ، يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، هَكَذَا قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ .

**٣٧** - وه حەج و غەزا لەگەڵ پێشەوادا بەردەوامە، نوێژی هەینی لە پشتیانەوە دروستە، لە پاش ئەوەش شەش ڕکعات نوێژ دەکرێت، دوو ڕکعات دوو ڕکعات بە جیا دەکرێ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەم شێوەیەی وتووە .

**٣٨** - وَالْخِلَافَةُ فِي قُرَيْشٍ إِلَى أَنْ يَنزِلَ عِيسَى بْنُ مَرْيَمَ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ.

**٣٨** - خیلافەت لەناو قورەیشدایە تاکو عیسا علیه السلام دادەبەزێ .

**٣٩** - وَمَن خَرَجَ عَلَى إِمَامٍ مِن أَئمَّةِ الْمُسلِمينَ؛ فَهُوَ خَارِجِي، قَدْ شَقَّ عَصَا الْمُسْلِمينَ، وَخَالَفَ الْآثَارَ، وَمِيتَتُهُ مِينَةٌ جَاهِلِيَّةٌ .

**٣٩** - وه هەر کەسێك دەرچوو لە دژی پێشەوایەك لە پێشەوایانی موسڵمانان، ئەوا دەرچووە و یەکڕیزی موسڵمانانی تێک داوە، وە پێچەوانەی ئاثارەکانی کردووە، وە مردنەکەی مردنێکی جاهیلانەیە .

**٤٠** - وَلَا يَحِلُّ قِتَالُ السُّلْطَانِ وَلَا الْخُرُوجُ عَلَيْهِ وَإِنْ جَارَ، وَذَلِكَ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لأبي ذَرٍّ الغفَارِيُّ : (اصْبِر، وَإِنْ كَانَ عَبْدًا حَبَشِيًّا) .

وَقَوْلِهِ لِلْأَنْصَارِ: (اصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الْحَوْضَ) .

وَلَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ قِتَالُ السُّلْطَانِ، فَإِنَّ فِيهِ فَسَادَ الدُّنْيَا وَالدِّينِ .

**٤٠** - وه حه‌ڵاڵ نییه شه‌ڕ له‌گه‌ڵ سوڵتان بكرێت و ده‌رچوون له دژی نییه هه‌رچه‌ند سته‌می كرد، له‌به‌ر ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ری الله ﷺ به أبو ذر الغفاري ی فه‌رمووی :

(ئارامبگره، هه‌رچه‌نده كۆیله‌یه‌كی حه‌به‌شی بێت) .

و به پیشتیوانانی فه‌رمووی :

(ئارامبگرن تاكو پێم ده‌گه‌ن له‌سه‌ر حه‌وزه‌كه) .

شه‌ڕكردن له‌گه‌ڵ سوڵتان له سوننه‌ت نییه، چونكه فه‌سادی دونیا و دینی تێدایه .

---

**: له هه‌موو وته‌كانی ئه‌هلی سوننه له‌م بابه‌ته و هاوشێوه‌كانیدا مه‌به‌ستیان له ده‌سه‌ڵاتدارێكی موسوڵمانه، جا خراپه‌كاربێت یان چاكه‌كار، نه‌وه‌ک ده‌سه‌ڵاتدارێكی كافر.**

**٤١** - وَيَحِلُّ قِتَالُ الْخَوَارِجِ إِذَا عَرَضُوا لِلْمُسْلِمِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ، وَلَيْسَ لَهُ إِذَا فَارَقُوهُمْ أَن يَطْلُبَهُمْ، وَلَا يُجْهِزُ عَلَى جَرِيحِهِمْ، وَلَا يَأْخُذُ فَيْئَهُمْ، وَلا يَقْتُلُ أَسِيرَهُمْ وَلَا يَتْبَعُ مُدْبِرَهُمْ .

**٤١** - وە کوشتاری خەواریج حەڵاڵە کاتێ دەست درێژ بکەن بۆ سامان و ماڵ و کەس و کاری موسوڵمانان، ئەگەر وازیان هێنا ئەوا بە شوێنیاندا ناڕۆی، وە بریندارەکانیان ناکوژرێت، وە دەستکەوتەکانیان نابردرێت، وە دیلەکانیان ناکوژرێت، وە ئەوانەی هەڵبێن دوایان ناکەوی .

---

ئیمام أحمد لە **(أصول السنة)** دا ئەڵێت :

**(کوشتاریکردنی دزەکان و خەواریجەکان درووستە ئەگەر پیاو بەرگری لە خۆیی و لە ماڵی خۆی بکات ئەگەر هێرشکرایە سەر نەفسی و ماڵی هێندەی ئەوەی لە توانایەتی بەرگری لە خۆی دەکات، وە نابێت گەر ئەوان وازیان هێنا یان بەجێیان هێشت ئەو بچێت دوایان بکەوێت و دوای ئەوەی کە ئەوان وازیان لێ هێنابوو، بۆ هیچ کەس نیە ئەوە بکات تەنها ئیمام و جێبەجێکاری مووسڵمانان دەتوانن بڕیار لەسەری بدەن، بەڵکو ئەو لەسەریەتی لەو شوێنەی کە ڕێگەی پێدراوە بەرگری لە خۆیی بکات، وە نیەتی هەبێت لە دڵەوە کە بەو بەرگری و ڕوو بەڕووبوونەوەی هیچ کەسێك نەکوژێت تەنها بەرگری بکات .**

**ئەگەر دزەکە لەسەر دەستی خاوەن ماڵەکە کوژرا لەو کاتەی کە بەرگری لە نەفسی خۆیی دەکرد ئەوا الله تعالى کوژراوەکە - دزەکە - دوور دەخاتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو خاوەن ماڵەکە لەو حاڵەدا کوژرا لە کاتێك ئەو بەرگری لە خۆی و ماڵی خۆیی دەکرد تکامان وایە کە پلەی شەهادەتی هەبێت هەروەك چۆن لە حەدیث ەکاندا هاتووە وە بە هەموو ئاثارەکان کەوا فرمانکراوە بە کوشتن بەڵام فەرمان نەکراوە بە کوشتنی و بە شووێن کەوتنی - هەموو شەڕێك کوشتن نییە چونکە ئەو خاوەن ماڵە لێرە بەرگری لە نەفسی خۆیی دەکات وە لە نیەتیشیدا نییە کە هیچ کام لە دزەکان بکوژێ بەڵکو تەنها بەرگری لە خۆیی بکات، ئەمە پێی دەوترێ قیتال، بەڵام خاوەن ماڵ یان**

**دزەکە کوژرا ئەوە قەتلە، کەواتە لێرە فەرمانکراوە بە قیتال بەڵام فەرمان نەکراوە بە قەتل کوشتن -** ، وەئەگەربریندارکران ئەوا نابێت بچیت بەدو ایانداو بیانکوژیتەوە، وە ئەگەر بە ئەسیریشتان گرتن مەیکوژن، وە حەددی لەسەر جێ بەجێ مەکە، بەڵکو هەموو ئەو کردەوانە جێبەجێکردنی حەد دەگەڕێنیتەوە بۆ پێشەوای مووسڵمانان واتە وەلی ئەمر دەبێت ئەو حوکمە جێ بەجێ بکات .

**٤٢** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أَنَّهُ لا طَاعَةَ لِبَشَرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ .

**٤٢** - وە بزانە ڕەحمەتی الله ـت لێبێت گوێڕایەڵی هیچ مرۆڤێک ناکرێت لە سەرپێچی الله ـدا .

**٤٣** - وَمَن كَانَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلَامِ فلَا يُشْهَدُ لَهُ بِعمَلِ خَيْرٍ وَلا شَرٌّ، فَإِنَّكَ لا تَدْرِي بِمَا يُخْتَمُ لَهُ عِنْدَ المَوْتِ، تَرْجُو لَهُ رَحْمَةَ اللَّهِ وَتَخافُ عَلَيْهِ، وَلَا تَدْرِي مَا يَسْبِقُ لَهُ عِنْدَ المَوْتِ إِلَى اللهِ مِنَ النَّدَمِ، وَمَا أَحْدَثَ اللهُ فِي ذَلِكَ الوَقْتِ إِذَا مَاتَ عَلَى الإِسْلَامِ، تَرْجُو لَهُ الرَّحْمَةَ، وَتَخَافُ عَلَيْهِ ذُنُوبَهُ، وَمَا مِنْ ذَنْبِ إِلا وَلِلْعَبْدِ مِنْهُ تَوْبَةٌ .

**٤٣** - وە هەر کەسێك لە ئەهلی ئیسلام بێت شایەتی بۆ نادرێت بە کارێکی چاك یان خراپ، چونکە تۆ نازانی بەچی شتێك کۆتایی پێ دێت لە کاتی مردندا، تکا و ڕەجای ڕەحمەتی الله ـت بۆی هەیە و دەترسی لە

تاوانەکانی، نازانی چی شتێك پێشی دەکەوێ لە کاتی مردندا بۆ لای الله لە پەشیمانی و الله تعالى چی شتێك دەکات لەو کاتەدا ئەگەر لەسەر ئیسلام مرد، تکای ڕەحمەتت بۆی هەیە و لە ئەنجامی تاوانەکانی دەترسی، وە هیچ تاوانێک نییە ئیللا بەندەکان بۆیان هەیە تەوبەی لێ بکەن .

---

**: مەبەستی ئەوەیە هەرکەسێک لە ئەهلی ئیسلام بێت ئەوا تۆ نابێت بڵێی ئەوە بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخە، چونکە تۆ نازانی بەچ شتێک کۆتایی پێ دێت و دەمرێت، بۆیە باشترین کار ئەوەیە کە گەر کەسێکی باش بوو یان بەسەر کاری باشەوە مرد ئەوا دوعای ڕەحمەتی بۆ بکەین، گەریش تاوانباریش بوو یان بەسەرتاوانەوە مرد ئەوا دوعای لێخۆشبوون و بەزەیی بۆی دەکەین، بەڵام ئەمە تایبەتە بە ئەوانەی ئەهلی ئیسلامن نەک کافرەکان .**

**ئیمام أحمد لە (أصول السنة) دا ئەڵێت :**

**شاهیدی نادەین بۆ هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە بە کردەوەیەك لە کردەوەکان بە بەهەشت یان دۆزەخ - ئەهلی قیبلە ئەوانەن کە موەحیدن ڕووەو قیبلە نوێژدەکەن - ، بەو ئومێدەین کەوا چاکەکاربێت وە دەترسین لەسەری، دەترسین لەسەرخراپەی تاوانکار، وە بەو ئومێدەین الله تعالى ڕەحمی پێ بکات .**

**٤٤** - وَالرَّجْمُ حقٌ .

**٤٤** - وە ڕەجم کردن حەقە .

: ئەو پیاوەی هاوسەری هەیە یان ئەو ئافرەتەی مێردی هەیە گەرزینا بکەن ئەوا ڕەجم دەکرێن چەندین بەڵگە لەم بارەیەوە هەیە، بۆیە لەو کتێبە عەقیدەیە باس دەکرێت وەکو ڕەددێک بۆ گومڕاکان کە دەڵێن ڕەجم بوونی نییە، هەرکەس نکۆڵی لێ بکات ئەوا کوفری کردووە .

لە (السنة لـ محمد بن نصر المروزي : ٣٨٥) هاتووە کە إبن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

(عمربن الخطاب وتاری دا سوپاسی اللە ی کرد و ستایشی کرد، وە وتی : ئەی خەڵکینە، ڕەجم حەددێکە لە حەددەکانی اللە، هەڵتان نەخەڵەتێنن، وە نیشانەی ئەوەش بریتیە لەوەی کە رسول الله ﷺ ڕەجمی کردووە، وە ئەبو بکر ڕەجمی کردووە، وە ئێمەش لەدوای ئەوان ڕەجممان کردووە، وە ویستم لە سووچێکی موسحەفدا بنووسم : بە شایەتی عمر بن الخطاب و عبدالرحمن بن عوف و فلان و فلان رسول الله ﷺ ڕەجمی کردووە، بەڵام قەومانێک دوای ئێوە دێن ڕەجم و دەججال و عەزابی قەبر و شەفاعەت و هاتنە دەرەوەی کۆمەڵێک لە جەهەننەم دوای بونیان بە خەڵوز ڕەتئەکەنەوە) .

٤٥ - وَالمَسْحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ سُنَّة .

٤٥ - وە مەسح کردن لەسەر هەردوو خوف سوننەتە .

: چونکە خەواریج و ڕافضوکان پێیان وایە مَسْح لەسەر خوف ناکرێت وەک لە کتێبەکانی سەلەف باسکراوە .

**٤٦** - وَتَقْصِيرُ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ سُنَّةٌ .

**٤٦** - وە كورتكردنەوەى نوێژ لە سەفەردا سوننەتە .

---

**أبو الفَضل صالح لە (كتاب المحنة) دا ئەڵێت :**

**(باوكم وتى ئەگەرڕێگەكە چوار بُرد درێژبوو ئەوا نوێژ تێیدا كورت ئەكرێتەوە، ئەوەش ئەكاتە شازدە فەرسەخ) .**

**هەرفەرسەخێك نزيكەى پێنج كيلۆمەترو نيوە .**

**٤٧** - وَالصَّومُ فِي السَّفَرِ مَن شَاءَ صَامَ، وَمَن شَاءَ أَفْطَرَ .

**٤٧** - ڕۆژوو گرتن لە سەفەر : هەر كەسێك ويستى ڕۆژوو دەگرێت، وە هەر كەسێك ويستى ڕۆژوو ناگرێت .

---

**لە كتێبى (الموطأ) ى ئيمامى مالك هاتووە :**

**٦٧٠ - أنس بن مالك رضي الله عنه ئەفەرمووێت :**

**(لەگەڵ رسول الله دا ﷺ سەفەرمان كرد لە ڕەمەزاندا، جا ڕۆژووگر ڕۆژوونەگرى عەيبدارنەكرد، وە ڕۆژوونەگريش ڕۆژووگرى عەيبدارنەكرد) .**

**٦٧١ - عروة بن الزبير ئەڵێت :**

(حمزة بن عمرو الأسلمي به رسول الله ى ﷺ وت ' من كەسێكى ڕۆژووگرم، ئايا له سەفەريشدا بەڕۆژوو ببم؟

رسول الله ﷺ پێى فەرموو : ' **ئەگەرويستت به ڕۆژوو ببيت، بەڕۆژوو به، ئەگەرويستت به ڕۆژوو نەبيت، به ڕۆژوو مەبە** ' ) .

**٦٧٢** - (عبدالله بن عمر رضي الله عنهما سەفەردا بەڕۆژوو نەئەبوو) .

**٦٧٣** - (هشام بن عروة ئەڵێت كه : باوكى له ڕەمەزاندا سەفەرى ئەكرد و ئێمەش سەفەرمان ئەكرد لەگەڵى، عروة بەڕۆژوو ئەبوو، وه ئێمە بەڕۆژوو نەئەبووين، جا فەرمانى پێنەئەكردين ڕۆژوو بگرين) .

**٤٨** - وَلَا بَأْسَ بِالصَّلاةِ فِي السَّرَاوِيلِ .

**٤٨** - وه نوێژكردن به شەرواڵەوە ئاساييه و دروسته .

**٤٩** - وَالنَّفَاقُ : أَن يُظْهِرَ الإِسْلامَ بِاللِّسَانِ ويُخْفِيَ الكُفْرَ بِالضَّمِيرِ.

**٤٩** - وه دووڕوويى بريتيه لەوەى به زمان ئيسلام دەرخات و له ناخيدا كوفر بشارێتەوە .

---

ئيمام أحمد له (أصول السنة) دا ئەڵێت :

**نیفاق كوفره - لێره مه‌به‌ستی نیفاقی گه‌وره‌یه - ، ئه‌وه‌یه كه كافر بیت به الله تعالی وغه‌یری ئه‌و بپه‌رستیت، وه له ڕووكه‌شدا ئیسلام ده‌ربخه‌یت، هه‌روه‌كو ئه‌و موونافیقانه‌ی كه له سه‌رده‌می رسول الله ﷺ دا هه‌بوون .**

**٥٠** - وَاعْلَمْ بِأَنَّ الدُّنْيَا دَارُ إِيْمَانٍ وَإِسْلَامٍ، وَأُمَّةُ مُحَمَّدٍ ﷺ فِيهَا مُؤْمِنُونَ مُسْلِمُونَ فِي أَحْكَامِهِمْ وَمَوَارِيثِهِمْ وَذَبَائِحِهِمْ وَالصَّلَاةِ عَلَيْهِمْ، وَلَا نَشْهَدُ لَأَحَدٍ بِحَقِيقَةِ الْإِيْمَانِ حَتَّى يَأْتِيَ بِجَمِيعِ شَرَائِعِ الإِسْلَامِ، فَإِنْ قَصَّرَ فِي شَيْءٍ مِن ذَلِكَ كَانَ نَاقِصَ الْإِيْمَانِ حَتَّى يَتُوبَ، وَاعْلَمْ أَنَّ إِيْمَانَهُ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى تَامَّ الْإِيْمَانِ أَوْ نَاقِصَ الْإِيْمَانِ، إِلَّا مَا أَظْهَرَ لَكَ مِن تَضْيِيعِ شَرَائِعِ الإِسْلامِ .

**٥٠** - وه بزانه ئه‌م دونیایه ماڵی ئیمان و ئیسلامه، وه ئوممه‌تی محمد ﷺ تێیدا ئیماندار و موسڵمانن له حوكمه‌كانیان و میراته‌كان سه‌ربڕینه‌كان نوێژكردن له‌سه‌ریان، وه شایه‌تی حه‌قیقه‌تی ئیمان بۆ هیچ كه‌سێك ناده‌ین تاكو هه‌موو شه‌ریعه‌ته‌كانی ئیسلام جێ به‌جێ نه‌كات، ئه‌گه‌ر له هه‌ر شتێكدا كه‌مته‌رخه‌می كرد، ئه‌وا ئیمانی كه‌م ده‌كات تاكو ته‌وبه ده‌كات، بزانه ئیمانه‌كه‌ی بۆ الله تعالی ئیمانێكی ته‌واوه یان ئیمانێكی نوقصانه، ئیللا ئه‌وه نه‌بێ شتێكی لێ بوه‌شێته‌وه له له‌ده‌ستدانی شه‌رائیعه‌كانی ئیسلام .

: واته تەزكیەی هیچ كەسێك ناكەین بەوەی بڵێین فلان ئیمانداره چونكه لەوانەیه ئەوشایەتی دانه شایستەی نەبێت، بەڵكوناوه گشتیەكەی پێ دەدرێت ودەڵێین موسوڵمانه .

**٥١** - وَالصَّلَاةُ عَلَى مَن مَاتَ مِن أَهْلِ القِبْلَةِ سُنَّةٌ، وَالمَرْجُومُ، وَالزَّانِي وَالزَّانِيَةُ وَالَّذِي يَقْتُلُ نَفْسَهُ، وَغَيْرُهُ مِن أَهْلِ القِبْلَةِ، والسَّكْرَانُ وَغَيْرُهُمْ : الصَّلاةُ عَلَيْهِمْ سُنَّةٌ .

**٥١** - وه نوێژكردن لەسەر ئەو كەسەی بمرێت له ئەهلی قیبله سوننەته، كەسی ڕەجمكراو و ئەو كەسەی زینای كردوه چ پیاو بێت یان ئافرەت و ئەو كەسەی خۆی دەكوژێت و جگه لەوه له ئەهلی قیبله و سەرخۆش، جگه لەوان ئەوا نوێژكردن لەسەریان سوننەته .

**٥٢** - وَلَا يَخْرِجُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ القِبْلِةِ مِنَ الْإِسْلَامِ حَتَّى يَرُدَّ آيَةٌ مِن كِتَابِ اللَّهِ، أَوْ يَرُدَّ شَيْئًا مِن آثَارِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَوْ يُصَلِّيَ لِغَيْرِ اللَّهِ، أَوْ يَذْبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ، وَإِذا فَعَلَ شَيْئًا مِن ذَلك فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْكَ أَن تُخْرِجَهُ مِنَ الإِسْلَامِ، فَإِذَا لَمْ يَفْعَلْ شَيْئًا مِن ذَلِك فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمُسْلِمٌ بِالإِسْمِ لا بِالحَقِيقَةِ .

**٥٢** - وه هیچ كەسێك له ئەهلی قیبله له ئیسلام دەرناكرێت تاكو ئایەتێك له قورئان ڕەت نەكاتەوه یان فەرموودەیەكی پێغەمبەری الله ﷺ

ڕەتنەکاتەوە، یان نوێژ بۆ جگە لە اللە تعالی بکات یان سەر ببڕێت بۆ جگە لە اللە، جا ئەگەر هەر کاتێك لەوانەی کرد ئەوا پێویستە لەسەرت لە ئیسلام دەری بکەیت، جا ئەگەر هیچ لەوانەی ئەنجام نەدا ئەوا ئیماندار و موسڵمانە بە ناو نەك بە حەقیقەت .

---

**: وتەی ئیمام (جا ئەگەر هەر کاتێك لەو انەی کرد ئەوا پێویستە لەسەرت لە ئیسلام دەری بکەیت) ڕەددە بۆ مەدخەلیە جەهمیەکان کە تەکفیر لەلایان بۆتە تەنها ناو، بەبێ ناوەڕۆک، نەیووت تەکفیر کاری تۆ نیە، نەیووت تەکفیر سودی نیە، نەیووت لێیگەڕێ تەنها بڵێ ئەم کارەت کوفرە ناڵێم تۆ کافری، بەڵکو ووتی واجبە لەسەرت بیخەیتە دەرەوە لە ئیسلام .**

**وە وتەی ئیمام (ئەوا ئیماندار و موسڵمانە بەناو نەك بە حەقیقەت) و اتا ئیسلامی حوکمی نەک حەقیقی، کە بەداخەوە عمومیە گڵاوەکان لەم جیاوازییە تێناگەن و موسوڵمانێتی موسوڵمانێک قبووڵ ناکەن بەوەی کە رسول الله ﷺ وەریگرتووە لە خەڵکی، بەڵکو وەکو خەواریجەکان چەند یاسایەکی بیدعیان داناوە و دەبێت ئەو یاسایە بیدعیانە جێبەجێ بکەیت ئینجا موسوڵمانی، وە ئەمەش گومر اییەکی ڕوونە .**

**٥٣ -** وَكُلُّ مَا سَمِعْتَ مِنَ الْآثَارِ شَيْئًا مِمَّا لَمْ يَبْلُغْهُ عَقْلُكَ، نَحْوَ قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ : (قُلُوبُ الْعِبَادِ بَيْنَ أَصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ) .

وَقَوْلِهِ : (إِنَّ اللَّهَ يَنْزِلَ إِلَى الْسَّمَاءِ الدُّنْيَا، وَيَنْزِلُ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَيَنْزِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّ جَهَنَّمَ لا يَزَالُ يَطْرَحُ فِيهَا حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهَا قَدَمَهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ) .

وَقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى لِلعَبْدِ : (إِنْ مَشَيْتَ إِلَيَّ هَرْوَلْتُ إِلَيْكَ) .

وَقَوْلِهِ : (خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ) .

وَقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ : (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ) .

وَقَوْلِهِ : (إِنَّ اللَّهَ تَبارَكَ وتَعالَى يَنْزِلَ يَوْمَ عَرَفَةَ) .

وَأَشْبَاءِ هَذِهِ الْأَحَادِيثِ، فَعَلَيْكَ بِالتَّسْلِيمِ وَالتَّصْدِيقِ وَالتَّفْوِيضِ وَالرُّضَا، وَلَا تُفَسِّرْ شَيْئًا مِن هَذِهِ بِهَوَاكَ، فَإِنَّ الإِيْمَانَ بِهَذَا وَاجِبٌ، فَمَن فَسَّرَ شَيْئًا مِن هَذَا بِهَوَاهُ وَرَدَّهُ فَهُوَ جَهْمِيٌّ.

**٥٣** - وە هەر کاتێك گوێبیستی فەرموودەیەک بووی نەتدەزانی چۆنە وەکو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری اللّٰه ﷺ کە دەفەرمووێت : (دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی اللّٰه ی میهرەبان عزّ وجل) .

وە فەرموودەی : (اللّٰه تعالی دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، وە لە ڕۆژی عەرەفەدا دادەبەزێ، وە لەڕۆژی قیامەتدا دادەبەزێ، دۆزەخ بەردەوام خەڵکی تێ دەکرێت تاکو اللّٰه تعالی قاچی خۆی دەخاتە سەر) .

وە وتەی اللّٰه تعالی بە بەندەکەی دەفەرمووێت : (ئەگەر بە ڕێکردن بەرەو لام بێیت ئەوا بە هەروەلە من بەرەو لات دێم) .

وە فەرموودەی : (اللّٰە تعالی ئادەمی دروست کردوە لەسەر وێنەی خۆی).

وە فەرموودەی پێغەمبەری اللّٰە ﷺ : (پەروەردگارم بینی لەسەر جوانترین وێنە) .

وە لە هاوشێوەکانی ئەم فەرموودەیانەدا تەسلیم بوون و بەڕاست زانین و گەڕاندنەوە و ڕازی بوونت لەسەرە، هیچ یەکێك لەوانە بە ئارەزووی خۆت تەفسیری مەکە، چونکە باوەڕهێنان بەوە واجبە، جا هەرکەسێک شتێکی لەوانە تەفسیر کرد بە ئارەزووی خۆی و ڕەتی کردەوە ئەوا جەهمی یە .

---

: مەبەستی ئیمام لە گەڕاندنەوە (تفویض) بریتیە لە تفویض ی چۆنیەتی سیفەتەکە، کە عەقیدەی سەلەفە، مەبەستی لە تفویض ی مانای سیفەتەکە نییە کە جەهمیەکان بەکاری دەهێنن بۆ نەفیکردنی سیفەتەکە .

**٥٤** - وَمَن زَعَمَ أَنَّهُ يَرَى رَبَّهُ فِي دَارِ الدُّنْيَا فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ .

**٥٤** - وە هەر کەسێك باوەڕی وابێت اللّٰە تعالی لە دونیادا دەبینێ ئەوا کافرە بە اللّٰە تعالی .

**٥٥** - وَالفِكْرَةُ فِي اللَّهِ بِدْعَةٌ لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ : (تَفَكَّرُوا فِي الْخَلْقِ، وَلَا تَفَكَّرُوا في اللهِ) .

فَإِنَّ الفِكْرَةَ فِي الرَّبِّ تَقْدَحُ الشَّكَ فِي القَلْب .

**٥٥** - وه بیرکردنەوە لە زاتی اللە بیدعەیە، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری اللە ﷺ دەفەرمووێت : (بیر لە دروستکراوەکان بکەنەوە، بیر لە اللە مەکەنەوە).

چونکە بیرکردنەوە لە زاتی اللە تعالی، دەبێتە هۆی دروستبوونی گومان لە دڵەکاندا .

: بەڵێ بێگومان ئەوە ڕاستە، چونکە ئێمەی دروستکراو ناتوانین پەی بە اللە تعالی ببەین، واتە ئەزانین اللە تعالی لەسەر عەرشە چونکە خۆی لە قورئان وای فەرمووە، وە رسول اللە ﷺ لە چەندین فەرموودەدا وای فەرمووە، وە هەموو سەلەف کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوە، بەڵام ئایا ئەتوانین بزانین اللە تعالی چۆن لەسەر عەرشە؟ نەخێر بێگومان، ناتوانین بزانین سیفەتەکانی اللە تعالی چۆنە، ئەزانین کە اللە تعالی لە کۆتایی هەموو سێیەکی شەوێک دائەبەزێتە ئاسمانی دنیا، بەڵام نازانین چۆن دائەبەزێت، چونکە زۆر شتی تر هەیە لە دروستکراوەکان کە ئێمە نازانین چۆنن، بۆ نمونە هەموومان باوەڕمان بە فریشتە هەیە، وەسفەکانی ئەزانین، بەس ئایا ئەزانین فریشتە لە حەقیقەتدا چۆنە؟ بێگومان نەخێر، کەوابێت ئەگەرتۆ نەتزانی فریشتە چۆنە کە دروستکراوێکە، ئەوە ئەولاترە نەزانیت اللە ی دروستکار چۆنە .

**٥٦** - وَاعْلَمْ أَنَّ الهَوَامَ والسَّبَاعَ والدَّوَابَّ نَحْوَ الذَّرِّ وَالذُّبَابِ وَالنَّمْلِ كُلَّهَا مَأْمُورَةٌ، وَلا يَعْلَمُونَ شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ اللهِ تَعَالَى .

**٥٦** - وه بزانه هەموو ئاژەڵێک کە نەخۆشی بۆ مرۆڤ دەگوێزێتەوە، وە ئاژەڵە دڕندەکان، وە ئەو ئاژەڵانەی لەسەر زەوی دەڕۆن، وەکو مێرووەکان و مێش و مێرووله، هەموویان فەرمان پێکراون، هیچ ناکەن نازانن ئیللا بە ئیزنی اللە تعالی نەبێت .

**٥٧** - وَالإِيْمَانُ بَأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ عَلِمَ مَا كَانَ مِن أَوَّلِ الدَّهْرِ، وَمَا لَمْ يَكُنْ، وَمَا هُوَ كَائِنْ أَحْصَاهُ وَعَدَّه عَدًّا، وَمَن قَالَ : إِنَّه لا يَعْلَمُ إِلَّا مَا كَانَ، وَمَا هُوَ كَائِنٌ فَقَدْ كَفَرَ بِاللَّهِ العَظِيمِ .

**٥٧** - وه هەبوونی باوەڕ بەوەی اللە تعالی زانیویەتی ئەوەی ڕووی داوە لە سەرەتای زەمانەوە، ئەوەیش ڕوونادات، ئەویش کە ڕوودەدات هەمووی ژماردووە و حسابی کردووە، هەر کەسێك بڵێت : اللە تعالی نازانێت تەنها ئەوە نەبێت کە ڕوویداوە و ئەوەی هەیە، ئەوا کوفری بە اللە تعالی کردووە .

---

**: ئەمەی ئیمام باسی ئەکات لێرە ڕەددە بۆ ئەو جۆرەی قەدەریەکان کە دەڵێن اللە نازانێت هەتا ڕوونەدات، ئەمەش وەسفکردنی اللە تعالی یە بە جەهل، وە نەفیکردنی سیفەتی زانستی اللە تعالی یە، هەربۆیە لەلایەن سەلەفەوە بە ئیجماع تەکفیرکراون .**

٨٥١ - أبو عبدالله - واته ئيمام أحمد - ئەڵێت : (ئەو قەدەريەى كە ئەڵێت الله نازانێت هەتا ڕووئەدات ئەوە كافرە) .

٨٥٢ - أبو عبدالله ئەڵێت : (الله هەميشە زانا بووە) .

٨٥٨ - المروذي ئەڵێت : (پرسيارم كرد لە أبو عبدالله دەربارەى قەدەرى؟ جا تەكفيرى نەكرد ئەگەردان بنێت بە زانستدا) .

٨٥٩ - المروذي ئەڵێت : گوێم لە أبا عبدالله بوو وتى : (ئەگەرزانستى ڕەتكردەوە ووتى ' الله عزوجل نازانێت هەتا ڕووئەدات ' ئەوە تۆبەى پێ ئەكرێت، ئەگەرتۆبەى نەكرد ئەكوژرێت .

| وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ | (آلِ عِمرَان : ٨١) ئەمە بەڵگەيە لەسەرقەدەريەكان) .

٨٦١ - أحمد بن جعفر النسائي ئەڵێت : بيستم أبا العباس ى هاوەڵى أبو عبيد پرسيارى لە أبا عبدالله كرد دەربارەى كەسێك كە زانست - ى الله تعالى - ڕەت ئەكاتەوە؟

وتى : (تۆبەى پێ ئەكرێت، ئەگەرتۆبەى نەكرد لە ملى ئەدرێت) .

السنة لـ الخلال

٥٨ - وَلَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ، وَصَدَاقٍ، قَلْ أَوْ كَثُرَ، وَمَن لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلِيٌّ فَالسُّلْطَانُ وَلِيٌّ مَن لا وَلِيَّ لَهُ .

٥٨ - وە هاوسەرگيرى دانامەزرێت بەبێ بوونى خاوەن و دوو شايەتى عەدل و مارەييەك جا ئەگەر كەم بێت يان زۆر بێت، هەر ئافرەتێك خاوەنى نەبێت

ئەوا دەسەڵاتدار [واتە : خەلیفەی مسوڵمانان] خاوەنی ئەو کەسانەیە کە خاوەنیان نییە .

٥٩ - وَإِذَا طَلَّقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا فَقَدْ حَرُمَت عَلَيْهِ، لَا تَحِلُّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ .

٥٩ - وە ئەگەر پیاوێک سێ جار خێزانەکەی خۆی تەڵاقدا ئەوا لێی حەڕام دەبێت، بۆی حەڵاڵ نابێت تاوەکو شو بە یەکێکی تر نەکات .

٦٠ - وَلَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَيَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ : زَانٍ بَعْدَ إِحْصَانٍ، أَوْ مُرْتَدُّ بَعْدَ إِيمَانٍ، أَوْ قَتَلَ نَفْسًا مُؤْمِنَةً بِغَيْرِ حَقٍّ، فَيُقْتَلُ بِهِ، وَمَا سِوَى ذَلِكَ فَدَمُ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ أَبَدًا حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ .

٦٠ - وە خوێنی هیچ موسڵمانێک حەڵاڵ نییە کە شایەتی دابێت هیچ خوایەک نییە بە حەق جگە لە الله، وە محمد ﷺ بەندە و پێغەمبەری ئەوە، ئیللا بە یەکێك لەم سێ خاڵە نەبێت : زینا بکات لە پاش ئەوەی هاوسەرگیری کردبێت، لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوە پاش ئەوەی ئیمانی هێنابێ کەسێکی

ئیمانداری بە ناحەق کوشتبێ بۆیە بەهۆی ئەوەوە دەکوژرێ جگە لەوانە ئەوا خوێنی موسڵمان بۆ موسڵمان حەڕامە تا هەستانی قیامەت .

**٦١** - وَكُلُّ شَيءٍ مِمَّا أَوْجَبَ اللهُ عَليهِ الفَنَاءَ يَفْنَى، إِلَّا الجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَالعَرْشَ وَالكُرْسِي، واللوحَ، وَالقَلَمَ، وَالصُّورَ، لَيْسَ يَفْنَى شَيْءٌ مِن هَذَا أَبَدًا، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ الخَلْقَ عَلَى مَا أَمَاتَهُم عَلَيهِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَيُحَاسِبُهُمْ بِمَا شَاءَ، فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ، وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ، وَيَقُولُ لِسَائِرِ الخَلْقِ مِمَّنْ لَمْ يُخْلَقْ لِلبَقَاءِ : كُونُوا تُرَابًا .

**٦١** - وە هەموو شتێک الله تعالی نەمانی لەسەر دانابێت ئەوە نامێنێت، ئیللا بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و کورسی و صور و قەڵەم **[ئەو قەڵەمەی کە الله مقادیری پێ نوسیوە]** و لەوح **[مەبەستی لوح المحفوظ ە]** نەبێ، ئەوا هیچ لەوانە نەمانیان بەسەردا نایێت، ئینجا الله تعالی خەڵکی زیندوو دەکاتەوە لەسەر ئەوەی لەسەری ڕۆحی کێشاون **[واتە لەسەرکوفریان لەسەر ئیمان مردووە، هەموویان بەپێی کارو کردەوەی خۆیان زیندوو دەکرێنەوە]** لە ڕۆژی قیامەتدا بەوەی خۆی ویستی لەسەر بێت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات، کۆمەڵێک بۆ بەهەشت و کۆمەڵێك بۆ دۆزەخ، پاشان بە هەموو دروستکراوەکانی ئەوانەی بۆ مانەوە درووست نەکراون پێیان دەفەرمووێت : ببنە خۆڵ .

**٦٢** - وَالإِيْمَانُ بِالقِصَاصِ يَومَ القِيَامَةِ بَيْنَ الخَلْقِ كُلِّهِمْ، بَنِي آدَمَ وَالسَّبَاعِ وَالهَوَامُ، حَتَّى لِلذَّرَّةِ مِنَ الذَّرَّةِ، حَتَّى يَأْخُذَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِبَعْضِهِمْ مِن بَعْضٍ؛ لِأَهْلِ الجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؛ وَلِأَهْلِ النَّارِ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ؛ وَأَهْلِ الجَنَّةِ بَعْضِهِمْ مِن بَعْضٍ، وَأَهْلِ النَّارِ بَعْضِهِمْ مِن بَعْضٍ .

**٦٢** - وه باوەڕبوون بە تۆڵەسەندنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە نێوان هەموو دروستکراوەکاندا، بەنی ئادەم و ئاژەڵە دڕندەکان و ئەو ئاژەڵانەی نەخۆشی بۆ مرۆڤ درووست دەکەن، تەنانەت مێرووڵەیەک لە مێرووڵەیەکی تر، تاکو الله تعالی حەقیان لە یەکتر وەردەگرێتەوە، بۆ ئەهلی بەهەشت لە ئەهلی ئاگر، بۆ ئەهلی ئاگر لە ئەهلی بەهەشت، بۆ ئەهلی بەهەشت لە یەکتر، و بۆ ئەهلی ئاگر لە یەکتر .

---

: و اتە الله حەقی هەموو مەخلوقەکانی دەسێنێت، بە ورد و درشتەوە، تەنانەت گەر کەسێکی ئیماندار ستەمی لە کافرێک کردبێ ئەوا الله حەقی لێ دەسێنێتەوە، بە پێچەوانەشەوە گەر کافرێک ستەمی لە ئیماندارێک کردبێ، ئەوا الله حەقی لێ دەسێنێتەوە، حەقی کەس لەسەرکەس نامێنێت، بە هەموو گیانەوەرەوەکانیشەوە .

رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (**مافەکان ئەگەڕێنرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان، تەنانەت تۆڵە لە بزنی قۆچدارئەسەنرێتەوە بۆ بزنی بێ قۆچ**) .

**الزهد لـ أسد السنة : ١٠٢**

**٦٣** - وَإِخْلَاصُ الـعَمَلِ اللَّهِ .

**٦٣** - وه ئیخلاص و نیاز پاکی له کردەوەکاندا بەوەی تەنها بۆ الله بێت.

---

**: کردەوەی انسان قبوڵ نابێ تەنیا به دوو مەرج نەبێ :**

**١ - الإخلاص : واته کەسەکه ئیماندار بێت و ئەو کردەوەیەی کە ئەنجامی دەدات تەنیا بۆ الله ئەنجامی بدات و دووربێت له ریا .**

**٢ - المتابعة : واته ئەوکردەوەیەی کە ئەنجامی دەدات ئەبێت لە سوننەت هبێت، پێغەمبەر ﷺ یان یەکێک له هاوەڵانی کردبێتیان، ئەگینا ئەبێته بیدعه وەک لەم حەدیسە هاتووە : (مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ) متفق عليه .**

**واته : (هەرکەسێک لەم دینەی ئێمەدا شتێک داهێنێت کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە ڕەتئەکرێتەو) .**

**٦٤** - وَالـرِّضَا بِقَضَاءِ اللَّهِ .

**٦٤** - وه ڕازی بوون به قەزا و قەدەری الله .

**٦٥** - وَالـصَّبْرُ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ .

**٦٥** - وه ئارام گرتن لەسەر حوکمی الله تعالى .

**٦٧** - وَالإِيْمَانُ بِمَا قالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَالإِيْمَانُ بِأَقْدَارِ اللهِ كُلُّهَا خَيْرِهَا وَشَرِّهَا، حُلْوِهَا وَمُرْهَا، قَدْ عَلِمَ اللهُ مَا الْعِبَادُ عَامِلُونَ، وَإِلَى مَا هُمْ صَائِرُونَ لَا يَخْرُجُونَ مِن عِلْمِ اللهِ، ولا يَكُونُ فِي الْأَرَضِينَ وَالسَّمَوَاتِ إِلَّا مَا عَلِمَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ.

**٦٧** - ئیمان هێنان بەوەی الله عزّوجل فەرموویەتی، وە ئیمانهێنان بە هەموو قەدەرەکانی الله بە چاك و خراپی، وە بە شیرین و تاڵیەوە، الله تعالی زانیویەتی بەندەکانی چی دەکەن، وە بەرەو کوێ دەڕۆن، لە زانستی الله تعالی دەرناچن، وە لە زەوی و ئاسمانەکان هیچ شتێك ڕوونادات ئیللا الله زانیویەتی.

---

: ئیمام حرب الكرماني ئەڵێ : قەدەر، خێرو شەڕی، کەم و زۆری، رووکەش و پەنهانی، خۆش و ناخۆشی، ئەوەی خۆشەویستە و ئەوەی پێت ناخۆشە، باش و خراپی، سەرەتا و کۆتایی، هەمووی لەلایەن الله تبارك وتعالى يە، بڕیارێکە داویەتی بەسەر بەندەکانی، وە قەدەرێکە بۆی داناون، هیچ یەکێک لە بەندەکان دەرناچن لە ویستی الله عزوجل و بڕیارەکانی، بەڵکو هەموو بەندەکان بەرەو ئەوە ئەچن کە الله دروستی کردوون بۆی، وە توشی ئەو قەدەرە ئەبن کە الله بۆی داناون هیچ چاریان نیە، ئەمەش عەدلە لەلایەن الله، عزربنا وجل .

**كتاب السنة لـ حرب الكرماني**

بۆ زیاتر ئاشنابوون بە بابەتی قەدەر لەسەر مەنهەجی سەلەف ئەم نامیلکەیە بخوێننەوە ؛

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/25

**٦٨** - وَتَعْلَمُ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَلَا خَالِقَ مَعَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ .

**٦٨** - وه بزانیت ئەوەی تووشت بووە نەدەبوایە تووشت نەبێت، وە ئەوەی تووشت نەبووە نەدەبوایە تووشت بێت **[واتە : ئەو شتەی تووشت بووە بزانە کە هەرگیز نەتدەتوانی خۆتی لێ لابدەیت، تاکو تووشت نەبێت، بۆیە هەرگیز نابێت بڵێی : گەر ئاوام کردبا ئەو شتە ڕووی نەدەدا، چونکە الله نوسیویەتی کە تووشت بێ یان تووشت نەبێ]** وە هیچ درووستکارێک لەگەڵ الله عزَّوَجَل دا نییە .

**٦٩** - والتَّكْبِيرُ عَلَى الجَنَائِزِ أَرْبَعُ، وَهُوَ قَولُ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَسُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالحَسَنِ بنِ صَالِحٍ، وَأَحْمَدَ بنِ حَنْبلِ، وَالفُقَهَاءِ، وَهَكَذَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ .

**٦٩** - وە تەکبیر کردن **[واتە : وتنی الله اکبر]** لەسەر جەنازە چوار جارە، ئەمەش وتەی : مالیکی کوڕی ئەنەس و سفیان الثوري و الحسن ی کوڕی صالح و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و فەقیهەکانە، بەم شێوەیە پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی .

---

**: سەلەف رحمهم الله لەو کتێبانەی کە عەقیدەی تێدا ڕوون دەکەنەوە هەندێک جار باسی چەند بابەتێکی فیقهیشی تێدا دەکەن، لەبەر ئەوەی ئەو بابەتە فیقهیە بووەتە**

**جیاکەرەوەی نێوان ئەهلی سوننە و بیدعەچییەکان، لەم بابەتەدا ڕافیزەکان موخالەفەی ئەهلی سوننە و جەماعە دەکەن و لەسەر مردووەکانیان پێنج تەکبیرە دەکەن .**

**٧٠** - وَالإِيْمَانُ بِأَنَّ مَعَ كُلِّ قَطْرَةٍ مَلَكُ يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ حَتَّى يَضَعَهَا حَيْثُ أَمَرَهُ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ .

**٧٠** - وە باوەڕ بوون بەوەی کە هەموو دڵۆپەیەکی باران فریشتەیەکی لەگەڵدایە، لە ئاسمانەوە دادەبەزێت تاکو دەیخاتە ئەو جێگەیەی الله عزوجل فەرمانی پێ کردووە .

**٧١** - وَالْإِيْمَانُ بِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ كَلَّمَ أَهْلَ القَلِيبِ يَومَ بَدْرٍ المُشْرِكِينَ كَانُوا يَسْمَعُونَ كَلَامَهُ .

**٧١** - وە باوەڕ بوون بەوەی کاتێ پێغەمبەری الله ﷺ لەگەڵ ئەهلی القليب دا قسەی کرد لە ڕۆژی بەدردا، واتە لەگەڵ موشریکەکان ئەوان قسەی پێغەمبەر ﷺ بیان دەبیست .

---

**: دوای ئەوەی کافرەکانی قوڕەیش زۆر ئازاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیاندا، ئینجا لە جەنگی بەدر الله تعالى مسوڵمانانی سەرخست، گەورەکانی قوڕەیش ئەوەی لەو ڕۆژەدا کوژران، وەکو شەیبەی کوڕی عوتبە، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، ابو جهل ی کوڕی هشام**

و ژمارەیەک زۆر لەو جەنگەی بەدردا کوژران، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد فڕێیان بدەنە [قُلیب] کە یەکێکە لەبیرەکانی بەدر، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوان ڕاوەستا و قسەی لەگەڵ ئەو اندا کرد دەیفەرموو : ئەی فلانی کوڕی فلان، ئەی ابو جهل ی کوڕی هشام، ئەی عوتبە، ئەی شەیبە، ئەی ئومەییە، یەک بەیەک قسەی لەگەڵ ئەو اندا کرد، ئایە ئەوەی الله تعالی بەڵێنی پێ دابوون حەق و ڕاست دەرچووە؟

ئەوەی الله بەڵێنی پێم دابوو حەق و ڕاست دەرچوو،

عومەر رضي الله عنه بە پێغەمبەری ﷺ ی فەرموو : ئەی پێغەمبەری الله ﷺ چۆن قسەیان لەگەڵ دەکەیت؟ لە کاتێکدا مردوویەکی بۆگەنن و نابیستن؟

فەرمووی : هەرگیز ئێوە گوێبیستتر نین لەوەی دەیڵێم لە ئەوان، بەڵام ئەوان قسە ناکەن .

و اتە ئەو انیش چاک قسەکانم دەبیستن بەڵام قسە ناکەن، ئەم باسە لە صحیحی بخاري و مسلم بە تەفاصیلی باسکراوە .

٧٢ - وَالإِيْمَانُ بِأَنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَرِضَ يَأْجُرُهُ اللَّهُ عَلَى مَرَضِهِ، وَالشَّهِيدُ يَأْجُرُهُ اللَّهُ عَلَى القَتْلِ .

٧٢ - وە باوەڕ بوون بەوەی هەر کەسێك ئەگەر نەخۆش بکەوێت ئەوا الله تعالی پاداشتی دەداتەوە لەسەر نەخۆشییەکەی، وە شەهید الله تعالی پاداشتی دەداتەوە لەسەر کوشتنەکەی .

**٧٣** - والإيمانُ بِأَنَّ الأَطْفَالَ إِذَا أَصَابَهُمْ شَيْءٌ فِي دَارِ الدُّنْيَا يَأْلَمُونَ، وَذلِكَ أَنَّ بَكْرَ ابْنَ أُخْتِ عَبْدِ الوَاحِدِ قَالَ : لَا يَأْلَمُونَ، وَكَذَبَ .

**٧٣** - وه باوەڕ بوون بەوەی منداڵان ئەگەر تووشی هەر شتێك بێن لە دونیادا ئەوا ئازاریان پێ دەگات، ئەوەتا بکر ی خوشکەزای عبدالواحد دەڵێ : ئەوان ئازاریان پێ ناگات، بزانە درۆی کردووە .

---

**: بۆیە ئەمەی لێرە باسکردووە تا ڕەددی ئەوپیاوە بداتەوە، کە کەسێکی خەواریج بووە، پێی وابووە گەر منداڵێک تووشی شتێک بێت ئەوا ئازاری پێ ناگات .**

**ئەم بۆچونە نەفامانەیە لە کاتێک خۆشیان بە زانا دەزانن، ئەگینا منداڵێک کاتێک تووشی شتێک دەبێت هاوار دەکات تاکو پێی بگەن، ئەمەش بەڵگەیە کە ئازاری پێدەگات، ئەمە شتێکی بینراو و هەست پێکراوە، بەڵام ئیتر (لَا يَعْقِلُونَ) الله المستعان .**

**٧٤** - وَاعْلَمْ أَنه لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ أَحَدٌ إِلَّا بِرَحْمَةِ اللَّهِ، وَلَا يُعَذِّبُ اللَّهُ أَحَدًا إِلَّا بِذُنُوبِهِ، بِقَدْرِ ذُنُوبِهِ، وَلَوْ عَذَّبَ أَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ بَرَّهُمْ وَفَاجِرَهُمْ، عَذَّبَهُمْ غَيْرَ ظَالِمٍ لَهُمْ، لا يَجُوزُ أَنْ يُقَالَ للَّهِ تَبَارَكَ وتَعَالى إِنَّهُ ظَالِمٌ، وَإِنَّمَا يَظْلِمُ مَنْ يَأْخُذُ مَا لَيْسَ لَهُ، وَاللهُ لَهُ الخَلْقُ وَالأَمْرُ، وَالخَلْقُ خَلْقُهُ، وَالدَّارُ دَارُهُ، لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ، وَهُمْ يُسْأَلُونَ، وَلَا يُقَالُ : لِمَ؟ وَكَيْفَ؟ لَا يَدْخُلُ أَحَدٌ بَيْنَ اللَّهِ وَبَيْنَ خَلْقِهِ .

**٧٤** - وه بزانه هيچ كەسێك ناچێته بەهەشتەوه ئيللا به ڕەحمەتى الله نەبێ، الله تعالى سزاى هيچ كەسێك نادات ئيللا به تاوانەكانى نەبێت، به ئەندازەى تاوانەكانى، ئەگەر سزاى ئەهلى ئاسمانەكان و زەوى بدات له چاكەكار و خراپەكاران، سزايان دەدات بەبێ ئەوەى ستەمى لێيان كردبێ، نابێت به الله تعالى بگوترێ: ستەمكار، چونكه ئەو كەسەى ستەم دەكات شتێك ببات و هى خۆى نەبێ، الله تعالى هەموو دروستكراو و بەڕێوەبردنى هەموو بونەوەر هەر به دەستى ئەوه، دروستكراوەكان دروستكراوى ئەوه، وه ماڵ ماڵى ئەوه **[ماڵەكان سێ دانەن: ماڵى دونيا، ماڵى بەرزەخ، ماڵى جێگير بوون، ئەويش ڕۆژى دوابيه]**، پرسيارى لێ ناكرێ هەر شتێك بكات بەڵكو ئەوان پرسياريان لێ ئەكرێت، ناگوترێت: بۆچى و چۆن؟ هيچ كەسێك ناكەوێته نێوان الله و دروستكراوەكانى.

---

**:** و اته هەموو كارەكانى الله تعالى پڕ حيكمەته و نابێت بڵێين بۆچى واى كردووه يان بۆچى واى نەكردووه، بەڵكو تەسليمى قەدەرەكانى دەبين و ئەوه دەكەين كه شەرع فەرمانى پێ كردووين.

**٧٥** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَطْعَنُ عَلَى الآثَارِ وَلَا يَقْبَلُهَا، أَوْ يُنْكِرُ شَيْئًا مِن أَخْبَارِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَاتَّهِمْهُ عَلَى الإِسْلَام، فَإِنَّهُ رَجُلٌ رَدِي القَوْلِ وَالمَذْهَبِ، وَإِنَّمَا طَعَنَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ رضي الله عنهم، لأَنَّا إِنَّمَا عَرَفْنَا اللَّهَ، وَعَرَفْنَا

رَسُولَهُ، وَعَرَفْنَا القُرْآنَ، وَعَرَفْنَا الخَيْرَ وَالشَّرَ وَالدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ بِالْآثَارِ فَإِنَّ القُرْآنَ إِلَى السُّنَّةِ أَحوَجُ مِنَ السُّنَّةِ إِلَى القُرْآنِ .

**٧٥** - وه ئەگەر بیستت کەسێك تانه له ئەثەر دەدات و وەری ناگرێت یان ئینکاری له شتێك له فەرموودەکانی پێغەمبەری الله ﷺ دەکات ئەوا تۆمەتباری بکه لەسەر ئیسلام، چونکه ئەوه کابرایەکی خاوەن مەزهەب و قسەیەکی خراپه، نابێت هەرگیز تانه له پێغەمبەری الله ﷺ و هاوەڵانی بدرێت [هەر کەس تانه بدات له پێغەمبەر ﷺ یان هاوەڵان ئەوا کافره به الله تعالی] چونکه ئێمه پێغەمبەری الله ﷺ و قورئان و چاکه و خراپه دونیا و دوا ڕۆژمان له ڕێگای ئەثەرەوه ناسیوه وه قورئان زیاتر پێویستی بەسوننەت هەیه لەوەی سوننەت پێویستی به قورئان بێت **[و اته سوننەت ڕوونکەرەوەی قورئانه]** .

---

**: ئەثەرو اته جێماو، به گشتی مەبەست پێی فەرموودەی رسول الله ﷺ ووتەی هاوەڵان و تابیعین و پاش ئەوانه، بەڵام ئەگەر به تایبەت باسکرا ئەوه تەنها مەبەست پێی وتەی هاوەڵان و تابیعین و پاش ئەوانه .**

**٧٦** - وَالكَلَامُ وَالجِدَالُ وَالخُصُومَةُ فِي القَدَرِ خَاصَّةٌ مَنْهِيٌّ عَنْهُ عِنْدَ جَمِيعِ الفِرقِ؛ لأَنَّ القَدَرَ سِرُّ اللَّهِ، وَنَهَى الرَّبُّ تَبَارَكَ وتَعَالى الْأَنْبِيَاءَ عَنِ الكَلَامِ فِي القَدَرِ، وَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ عنِ الخُصُومَةِ فَي القَدَرِ، وَكَرِهَهُ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَضِي

اللَّهُ عَنْهُم وَكَرِهَهُ التَّابِعُونَ، وَكَرِهَهُ العُلَمَاءُ، وَأَهْلُ الوَرَعِ، وَنَهَوا عَنِ الجِدَالِ فِي القَدَرِ، فَعَلَيْكَ بِالتَّسْلِيمِ وَالْإِقْرَارِ وَالإِيمَانِ، وَاعْتِقَادِ مَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي جُمْلَةِ الأَشْيَاءِ، وَاسْكُتْ عَمَّا سِوَى ذَلِكَ .

**٧٦** - وه قسه‌كردن و ركابه‌ری و مشتومڕ كردن به تایبه‌تی له قه‌ده‌ردا نه‌هی لێ كراوه له‌لایه‌ن هه‌موو گرووپ و كۆمه‌ڵه‌كانه‌وه، چونكه قه‌ده‌ر نهێنی الله یه، په‌روه‌ردگار نه‌هی كردووه له پێغه‌مبه‌ران قسه له قه‌ده‌ردا بكه‌ن، پێغه‌مبه‌ری الله ش ﷺ نه‌هی كردووه له مشتومڕ كردن له قه‌ده‌ردا، وه هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری الله ش ﷺ پێیان ناخۆش بووه و شوێنكه‌وتوانیش حه‌زیان لێ نه‌كردوه، زانایان و ئه‌هلی وه‌رع حه‌زیان لێ نه‌كردوه نه‌هییان كردووه له جیدال كردن له قه‌ده‌ردا، بۆیه ئه‌وه‌ی له‌سه‌رته ته‌سلیم بوون و دان پێدانان و باوه‌ڕهێنانه پێی، باوه‌ڕ به‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری الله ﷺ فه‌رموویه‌تی به گشتی، وه بێ ده‌نگ به له جگه له‌وانه .

---

: باوه‌ڕهێنان به قه‌زاو قه‌ده‌ر یه‌كێكه له ئه‌ركانی ئیمان، وه هه‌رگیزیش نابێت قسه‌ی ده‌رباره‌ی بكه‌ین جگه له‌وه‌ی له قورئان یان له فه‌رمووده‌كان یان وته‌ی سه‌له‌ف باسكراوه، وه مشت و مڕ كردن له قه‌ده‌ر تووشی گومڕاییت ده‌كات چونكه هه‌رگیز ناگه‌یته ئامانج، ته‌نیا ئه‌بێت ته‌سلیم و ملكه‌چ بین .

**٧٧** - وَالإِيمَانُ بِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُسْرِيَ بِهِ إِلَى السَّمَاءِ، وَصَارَ إِلَى الْعَرْشِ وكَلَّمَ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، وَدَخَلَ الجَنَّةَ، وَاطَّلَعَ إِلَى النَّارِ، وَرَأَى الْمَلائِكَةَ، وَسَمِعَ كَلَامَ اللهِ، وَنُشِرَتْ لَهُ الأَنْبِيَاءُ، وَرَأَى سُرَادِقَاتِ العَرْشِ وَالكُرْسِيَّ، وَجَمِيعَ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرَضِينَ فِي اليَقَظَةِ، حَمَلَهُ جِبْرِيلُ عَلَى البَرَاقِ حَتَّى أَدَارَهُ فِي السَّمَوَاتِ، وَفُرِضَتْ عَلَيْهِ الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ فِي تِلْكَ اللَّيْلَةِ، وَرَجَعَ إِلَى مَكَّةَ لَيْلَتِه، وَذَلِكَ قَبْلَ الهِجْرَةِ.

**٧٧** - وه باوەڕبون بەوەی کە پێغەمبەری اللّٰه ﷺ شەوڕەوی پێ کرا بۆ ئاسمان و ڕۆیشت بەرەو عەرش، لەگەڵ اللّٰه تعالی قسەی کرد و چووە بەهەشتەوە و ئاگری بینی و فریشتەی بینی و قسەی اللّٰه تعالی ی بیست و پێغەمبەرانی بۆ کۆکرایەوە، دەوروبەری عەڕش و کورسی و هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بینی بە بەئاگاییەوە **[ئەمە ڕەددە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن بە خەو بووە]**، جبریل لەسەر پشتی بوراق هەڵیگرت تاکو بە ئاسمانەکاندا گەڕاندی ئەو شەو پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرزکراو هەر ئەو شەوە گەڕایەوە مەککە، ئەمەش لە پێش هیجرەت ڕوویدا.

---

**: میعراج بریتیە لە چونە سەرەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە بیت المقدس ـەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان و حەوت چینەکەی ئاسمانی تێپەڕاند و گەیشتە سدرة المنتهی، گوێی لە قسەی اللّٰه بوو، اللّٰه لەم شەوە فەرمانی نوێژی پێ کرد، بەهەشت و دۆزەخی بینی، وە پێغەمبەرانی علیهم السلام لە ئاسمانەکاندا بینی، اللّٰه تعالی ش ئەوانی کۆکردەوە**

ئەویش واتە پێغەمبەرﷺ پێش نوێژی بۆ کردن، وەک دەرخستنی فەزڵ بەسەر ئەواندا، هەر لەم شەوە پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرد، ئینجا ئەزیزمان ﷺ دابەزی بۆ بیت المقدس، دواتر لە بیت المقدس ەوە گەڕایەوە بۆ مەککە بەیەک شەو ئەمە هەموو بە توانا و دەسەڵاتی الله بوو کە هیچ شتێک لەژێر دەستی دەرناچێ، ئەو شەوە پێغەمبەرﷺ لە مەککە ڕۆژی کردەوە . ئەمە تەنیا وەک بەرچاو ڕوونیەک ئەگینا ئەثەر زۆرن لەم بارەوە کە بەجوانی باسی دەکەن .

**٧٨** - وَاعْلَمْ أَنَّ أَرْوَاحَ الشُّهَدَاءِ فِي قَنَادِيلَ تَحْتَ العَرْشِ تَسْرَحُ فِي الجَنَّةِ، وَأَرْوَاحَ المُؤمِنِين تَحْتَ العَرْشِ، وَأَرْوَاحَ الفُجَّارِ وَالكُفَّارِ فِي بَرَهُوتَ، وَهِي فِي سِجِّين.

**٧٨** - وە بزانە ڕۆحی شەهیدەکان لە چراکانی ژێر عەرش دان و لە بەهەشتدا دەگەڕێن، وە ڕۆحی باوەڕداران لە ژێر عەرش دایە، وە ڕۆحی خراپەکاران و بێ باوەڕان لە بیری برهوت دان، کە ئەویش ئاگری دۆزەخە [ئاگری دۆزەخ ناوی زۆرە، یەکێک لەوانە سجین ە] .

**٧٩** - وَالإِيمَانُ بِأَنَّ المَيِّتَ يُقْعَدُ فِي قَبْرِهِ، وَيُرْسَلُ الله فِيهِ الرُّوحُ حَتَّى يَسْأَلَهُ مُنْكَرُ وَنَكِيرٌ عَنِ الإِيمَانِ وَشَرَائِعِهِ، ثُمَّ يُسَلَّ رُوحُهُ بِلَا أَلَمٍ .

**٧٩** - وه باوه‌ڕبوون به‌وه‌ی مردوو له گۆڕه‌كه‌یدا داده‌نیشرێت و الله ڕۆحه‌كه‌ی بۆ ده‌گێڕێته‌وه تاكو منكر ونكير پرسیاری لێ ده‌كه‌ن ده‌رباره‌ی ئیمان و شه‌ریعه‌ته‌كانی ئینجا ڕۆحه‌كه‌ی لێ ده‌رده‌چێ به‌بێ هیچ ئازارێك .

**٨٠** - وَيَعْرِفُ المَيْتُ الزَّائِرَ إِذَا زَارَهُ، وَيَتَنَعَمُ الْمُؤْمِنُ فِي القَبْرِ، وَيُعَذِّبُ الفَاجِرُ كَيْفَ شَاءَ اللّٰهُ .

**٨٠** - مردوو ئه‌و كه‌سه‌ ده‌ناسێته‌وه كه سه‌ردانی دتكات، كه‌سی ئیماندار له گۆڕه‌كه‌یدا له خۆشیدایه و سزای خراپه‌كار ده‌درێت به‌و شێوه‌یه‌ی الله تعالى ویستی لێ بێت .

**٨١** - وَاعْلَمْ أَنَّ الشَّرِّ وَالخَيْرَ بِقَضَاءِ اللَّهِ وَقَدَرِهِ .

**٨١** - وه بزانه چاكه و خراپه به قه‌زا و قه‌ده‌ری الله ڕوو ده‌ده‌ن .

---

**: هه‌رشتێك ڕووده‌دات له‌م جیهانه له‌خۆیه‌وه نییه به‌ڵكو نوسراوه له لوح المحفوظ به چاك و خراپ، وه به سوود و قازانج، به برسێتی و تێربوون، به هه‌ژاری و ده‌وڵه‌مه‌ندی هتد . . . ، گشتی له‌لایه‌ن الله تعالى وه‌یه .**

**٨٢** - وَالإِيمَانُ بِأَنَّ اللهَ هُوَ الذِي كَلَّمَ مُوسَى بنَ عِمْرَانَ عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ يَوْمَ الطُّورِ، وَمُوسَى يَسْمَعُ مِنَ اللَّهِ الكَلامَ بِصَوْتٍ وَقَعَ فِي مَسَامِعِهِ مِنْهُ، لَا مِنْ غَيْرِهِ، فَمَنْ قَالَ غَيْرَ هَذَا فَقَدْ كَفَرَ بِاللَّهِ العَظِيم .

**٨٢** - وه باوه‌ڕبوون به‌وه‌ی الله تعالى خۆی له‌گه‌ڵ موسای كوڕی عیمراندا قسه‌ی كرد له ڕۆژی الطور و موساش گوێی له قسه‌كانی الله بوو به ده‌نگه‌وه گه‌یشته گوێی موسا، له جگه له الله وه نه‌بوو، جا هه‌ر كه‌سێك جگه له‌م قسه‌یه بكات ئه‌وا كوفری به الله تعالى كردووه .

---

**: ئه‌مه ڕه‌دده بۆ جه‌همی و موعته‌زیله ئه‌شعه‌ری و ماتوریدیه جه‌همیه‌كان كه ده‌ڵێن : الله تعالى قسه ناكات گه‌رقسه بكات كه‌و اته مه‌خلوقه والعیاذ بالله، ئه‌مه وته‌ی ئه‌وبێ عه‌قڵانه‌یه، له ڕاستیدا الله تعالى قسه ده‌كات به قسه‌كردنێ كه ببیسترێ، وه قورئانیش وته‌ی الله یه، ئه‌مه‌یه عه‌قیده‌ی ئه‌هلی سوننه و جماعه ده‌رباره‌ی قسه‌كردنی الله .**

**٨٣** - وَالعَقْلُ مَوْلُودٌ، أُعْطِيَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنَ العَقْلِ مَا أَرَادَ اللهُ، يَتَفَاوُتُونَ فِي العُقُولِ مِثْلَ الذَّرَّةِ فِي السَّمَوات، وَيُطْلَبُ مِن كُلِّ إِنْسَانٍ مِنَ العَمَلِ عَلَى قَدْرِ مَا أَعْطَاهُ مَنَ العَقْلِ، وَلَيْسَ العَقْلُ بِاكْتِسَابِ، إِنَّمَا هُوَ فَضْلٌ مِنَ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى .

**٨٣** - وه عه‌قڵیش له منداڵیه‌وه به‌خشراوه، الله تعالى به ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه‌ی بیه‌وێ عه‌قڵی به‌خشیوه‌ته هه‌موو مرۆڤێک، جیاوازن له عه‌قڵیاندا وه‌كو

گەردیلە لە ئاسمانەکاندا، مرۆڤ داوای کارکردنی لێکراوە بە ئەندازەی ئەوەی الله تعالی عەقڵی پێ بەخشیوە ، عەقڵ بە هەوڵدان و بەدەستهێنان نییە، بەڵکو فەزڵی الله یە تبارک و تعالی .

**٨٤** - وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ فَضَّلَ العِبَادَ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ، عَدْلًا مِنْهُ لَا يُقَالُ : جَارَ وَلَا حَابَى، فَمَن قَالَ : إِنَّ فَضْلَ اللَّهِ عَلَى الْمُؤْمِنِ وَالكَافِرِ سَوَاءٌ فَهُوَ صَاحِبُ بِدْعَةٍ، بَلْ فَضَّلَ اللهُ الْمُؤْمِنَ عَلَى الكَافِرِ، وَالطَّائِعَ عَلَى العَاصِي، وَالمَعْصُومَ عَلَى المَخْذُولِ، عَدْلًا مِنْهُ، هُوَ فَضْلُهُ يُعْطِيهِ مَنْ يَشَاءُ، وَيَمْنَعُ مَنْ يَشَاءُ.

**٨٤** - وە بزانە الله تعالی فەزڵی بەندەکانی داوە بەسەر یەکتردا لە دونیا و دوارۆژدا، ئەمەش لە دادپەروەری ئەوە و ناگوترێت : ئەو ستەمی کردوە لایەنگیری لایەکیانی کردووە، هەر کەسێک بڵێت : فەزڵی الله تعالی بەسەر ئیماندار و بێ باوەڕدا وەکو یەکە، ئەوە بیدعەچییە، بەڵکو الله تعالی فەزڵی ئیمانداری داوە بەسەر بێ باوەڕاندا، وە کەسی گوێڕایەڵ بەسەر کەسی سەرپێچیکاردا، وە کەسی پارێزراو بەسەر کەسی لاڕێدا، ئەمەش دادپەروەری ئەوە، ئەوە فەزڵی خۆیەتی دەیبەخشێتە هەرکەسێ ویستی لێ بێت، وە لە هەرکەسێ بیەوێت دەیگرێتەوە .

**٨٥** - وَلا يَحِلُّ أَنْ تَكْتُمَ النَّصِيحَةَ لِلمُسْلِمِينَ بَرْهُمْ وَفَاجِرِهُمْ فِي أَمْرٍ الدِّينِ، فَمَنْ كَتَمَ فَقَدْ غَشَّ الْمُسْلِمِينَ، وَمَن غَشَّ الْمُسْلِمِينَ فَقَدْ غَشَّ الدِّينَ، وَمَن غَشَّ الدِّينَ فَقَدْ خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ .

**٨٥** - وه حه‌ڵاڵ نییه ئامۆژگاری له هیچ موسڵمانێک بشاردرێته‌وه، له چاکه‌کاران و خراپه‌کارانیان له هه‌ر کارێك له کاروباری ئه‌م دینه، جا هه‌ر که‌سێك شاردییه‌وه ئه‌وا غه‌شی له موسڵمانان کردووه، هه‌ر که‌سێك غه‌ش له موسڵمانان بکات ئه‌وا غه‌شی له دین کردووه و هه‌ر که‌سێک غه‌ش له دین بکات ئه‌وا خیانه‌تی له الله و پێغه‌مبه‌ر ﷺ و ئیمانداران کردووه .

---

: بۆزیاترئاشنابوون به‌م بابه‌ته ئه‌م نامیلکه‌یه بخوێننه‌وه

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/388

**٨٦** - والله تَبَارَكَ وتَعَالى سَمِيعٌ بَصِيرٌ عَلِيمٌ، يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ، قَدْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّ الخَلْقَ يَعْصُونَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَهُمْ، عِلْمُهُ نَافِذٌ فِيهِمْ، فَلَمْ يَمْنَعْهُ عِلْمُهُ فِيهِمْ أَنْ هَدَاهُمْ للإِسْلَام وَمَنَّ بِهِ عَلَيْهِمْ كَرَمًا وَجُودًا وَتَفَضُّلًا، فَلَهُ الحَمْدُ .

**٨٦** - وه الله تبارک وتعالى بیسه‌ر و بینه‌ر و زانایه، ده‌سته‌کانی واڵا و کراوه‌ن، ده‌یزانی به‌نده‌کانی سه‌رپێچی ده‌که‌ن پێش ئه‌وه‌ی دروستیان بکات،

زانستی ئەو دەربارەی [دروستکراوەکانی] گشتیە، ئەو زانینەی خۆی بەرامبەریان ڕێگر نەبووە بۆ هیدایەت دانیان بۆ ئیسلام، منەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا وەکو بەخشندەیی و میهرەبانی و فەزڵێك، بۆیە سوپاس ستایش تەنها بۆ ئەوە.

**٨٧** - وَاعْلَمْ أَنَّ البِشَارَةَ عِنْدَ المَوْتِ ثَلَاثُ بِشَارَاتٍ ؛

**أ** - يُقَالُ : أَبْشِرْ يَا حَبِيبَ اللَّهِ بِرِضًا اللهِ وَالجَنَّةِ .

**ب** - وَيُقَالُ : أَبْشِرْ يَا عدو اللهِ بِغَضَبِ اللهِ وَالنَّارِ .

**ج** - وَيُقَالُ : أَبْشِرْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بِالجَنَّةِ بَعْدَ الإنتِقام، هَذَا قَوْلُ ابنِ عَبَّاس رضي الله عنه .

**٨٧** - وە بزانە موژدەدان لە كاتی مردندا سێ موژدەدانە :

**أ** - دەوترێت : موژدەت لێبێ ئەی خۆشەویستی الله بە ڕازی بوونی الله و بەهەشت .

**ب** - دەوترێت: موژدەت لێبێ ئەی دوژمنی الله بە تووڕە بوونی الله و ئاگر .

**ج** - دەوترێت : موژدەت لێبێ ئەی بەندەی الله بە بەهەشت لە پاش تۆڵەلێكردنەوە، ئەمە قسەی إبن عباس رضي الله عنه یە .

**٨٨** - وَاعْلَمْ أَنَّ أَوَّلَ مَن يَنْظُرُ إِلَى اللهِ تَعَالَى فِي الجَنَّةِ الأَضِرَّاءُ ثُمَّ الرِّجَالُ، ثُمَّ النِّسَاءُ بِأَعْيُنِ رُءُوسِهِمْ، كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (**إِنَّكُمْ سَتَرُونَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ القَمَرَ لَيْلَةَ البدرِ لا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ**)، وَالإِيْمَانُ بِهَذَا وَاجِبٌ وَإِنْكَارُهُ كُفْرٌ .

**٨٨** - وه بزانه یەکەم کەسێك تەماشای الله دەکەن لە بەهەشتدا نابیناکانن، ئینجا پیاوان، ئینجا ئافرەتان بە چاوی سەریان، هەروەکو پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی : (ئێوە پەروەردگارتان دەبینن وەک چۆن لە شەودا مانگی چواردە دەبینن بەبێ ئەوەی هیچ ئاستەنگیەکتان بێتە پێش لە بینینی)، باوەڕبوون بەمە واجبە و ئینکاری کردنی کوفرە .

---

**: موعتەزیلە و جەهمی و ماتوریدی و ئەشعەریە جەهمیەکان بینی الله تعالی لە قیامەتدا بە چاوڕەت ئەکەنەوە و کافرن پێی، بۆ زیاتر ئاشنابوون بەم بابەتە ئەم نامیلکەیە بخوێننەوە**

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/408

**٨٩** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ الله أَنَّهُ ما كَانَت زَنْدَقَةٌ قَط، وَلَا كُفْرٌ، وَلَا شَك، وَلَا بِدْعَةٌ، وَلَا ضَلَالَةٌ وَلا حَيْرَةٌ فِي الدِّيْنِ إِلَّا مِنَ الكَلامِ، وَأَهْلِ الكَلَامِ وَالجَدَلِ وَالْمِرَاءِ وَالخُصُومَةِ وَالعُجْبِ، وَكَيْفَ يَجْتَرِئُ الرَّجُلُ عَلَى الْمِرَاءِ وَالخُصُومَةِ وَالجِدَالِ، وَاللَّهُ تَعَالَى يَقُولُ : ﴿ **مَا يُجَدِلُ فِي آياتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا** ﴾ **(غافر : ٤)** فَعَلَيْكَ بِالتَّسْلِيمِ والرضا بالآثَارِ وَالكَفْ وَالسُّكُوتِ .

**٨٩** - وە بزانە هەرگیز زەندەقە و کوفر و گومان و بیدعە و گومڕایی لە دیندا نەبووە ئیللا لە کەلام و ئەهلی کەلام و ململانێ دەمبازی و مشت و مڕ و ناکۆکیەوە نەبێ .

سەرسامی لەوەدایە چۆن کەسێک جورئەتی مشت و مڕ و ناکۆکی و جیدال دەکات لە کاتێکدا اللە تعالی فەرموویەتی : | **مَا يُجَدِلُ فِي آيات اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا** | (غافر : ٤)

واتە : هیچ کەس لە بەرامبەر ئایەتەکانی اللە مجادلە و دەمەدەمێ ناکات جگە لەوانەی بێ باوەڕن .

جا ئەوەی لەسەرتە تەسلیم بوون و ڕازی بوون بە فەرموودەکان و وازهێنان و بێ دەنگییە .

---

**: موعتەزیلە و جەهمی و ماتوریدی و ئەشعەریە جەهمیەکان ئەهلی کەلامن، بۆ زیاتر ئاشنابوون بە جەهلی کەلام وزەلیلی ئەهلی کەلام لەلای سەلەف ئەم نامیلکەیە بخوێنەرەوە:**

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/444

**علم بۆ مناقشە و ڕەددانەوە کۆ مەکەوە بەڵکو بۆ پەروەردەکردنی خۆت کە عقیدەت لەسەروتەی اللە و پێغەمبەرﷺ و پێشەو ایانی سەلەف بێت .**

عبدالله كوڕى يسري ڕەحمەتى الله ى لێبێت فەرموويەتى : (سوننەت ئەوە نييە كە تۆ ڕەددى ئەهلى بيدەع بدەيتەوە، بەڵكو ئەوەيە كە تۆ گفتتت لەگفتيان نەگەڕێ و نزيكيان نەكەويتەوە) .

**الإبانة لإبن بطة**

**٩٠** - وَالإيمَانُ بِأَنَّ اللهَ تَبَارَكَ وتَعَالى يُعَذِّبُ الخَلْقَ فِي النَّارِ فِي الأَغْلالِ وَالْأَنكَالِ وَالسَّلَاسِلِ، وَالنَّارُ فِي أَجْوَافِهِمْ وَفَوْقَهُمْ وَتَحْتَهُمْ، وَذَلِكَ أَنَّ الجَهْمِيَّةَ مِنْهُمْ هِشَامٌ الفُوطِيُّ قَالَ : إِنَّمَا يُعَذِّبُ اللَّهُ عِنْدَ النَّارِ، رَدًّا عَلَى اللَّهِ وَعَلَى رَسُولِهِ ﷺ .

**٩٠** - وە باوەڕ بەوەی الله تعالى خەڵكى سزا دەدات لە ئاگردا لە كۆت و بەند و زنجيردا ، وە ئاگر لە ناخيان و سەرەوە و خوارەوەيانەوەيە، چونكە جەهمييەكان لەوانە هشام الفوطي دەڵێت : الله خەڵكى سزا دەدات لە تەنيشت ئاگر، ئەمەش بۆ ڕەتكردنەوەی قسەی الله تعالى و پێغەمبەرەكەيەتى ﷺ .

---

الأغلال : واتە ئەوان دەستيان تاكوگەردنيان بە كۆت وزنجيردەبەسترێتەوە . وەك الله تعالى فەرموويەتى : ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا﴾ (سورة الإنسان : ٤) پەنا بە الله تعالى .

الأنكال : ئامێرەكانى سزادانە كە زنجير و كۆت و ئاگرە، وەك الله تعالى فەرموويەتى : ﴿إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا﴾ (سورة المزمل : ١٢) .

پەنا بە الله تعالى لەو سزا سەختە .

**٩١** - وَاعْلَمْ أَنَّ صَلَاةَ الفَرِيضَةِ خَمْسُ صَلَوَاتٍ، لَا يُزَادُ فِيهِنَّ وَلَا يُنْقَصُ فِي مَواقِيتِهَا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، إِلَّا المَغْرِبَ، فَمَنْ قَالَ : أَكْثَرُ مِن خَمْسٍ؛ فَقَدِ ابْتَدَعَ، وَمَن قَالَ : أَقَلُّ مِن خَمْسٍ فَقَدِ ابْتَدَعَ، لَا يَقْبَلُ اللهُ شَيْئًا مِنْهَا إِلَّا لِوَقْتِهَا، إِلَّا أَن يَكُونَ نِسْيَانًا فَإِنَّهُ مَعْذُورٌ يَأْتِي بِهَا إِذَا ذَكَرَهَا، أَوْ يَكُونَ مُسَافِرًا فَيَجْمَعُ بَيْنَ الصَّلاتَيْنِ إِنْ شَاءَ .

**٩١** - وه بزانه نوێژه فەرزەكان پێنج نوێژن، لەوانە زیاد ناكرێت و كەم ناكرێتەوە لە كاتەكانیاندا، لە سەفەردا دوو ڕكاتە، تەنها مەغریب نەبێ، جا هەر كەسێك بڵێت : نوێژەكان لە پێنج فەرز زیاترە ئەوا بیدعەی كردووە، وە هەر كەسێك بڵێت : نوێژەكان لە پێنج فەرز كەمترە ئەوا بیدعەی كردووە، الله تعالی وەریناگرێت ئیللا لە كاتی خۆیدا نەبێ، ئیللا مەگەر كەسێك لە بیری چووبێت ئەوا عوزری هەیە، كاتێ بیری هاتەوە ئەوا ئەنجامی دەدات، یان موسافیر بێت ئەوە لە نێوان دوو نوێژدا كۆدەكاتەوە ئەگەر بیەوێ .

**٩٢** - وَالزَّكَاةُ مِنَ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ وَالتَّمْرِ وَالحُبُوبِ وَالدَّوَابِّ، عَلَى مَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَإِنْ قَسَّمَهَا فَجَائِزٌ، وَإِنْ دَفَعَهَا إِلَى الْإِمَامِ فَجَائِزٌ .

**٩٢** - وه زەكـاتدان لـه ئاڵتون و زيو و خورما و دانەوێڵە و وڵاخدا هەروەكـو پێغەمبەری الله ﷺ فەرموويەتی، جا ئەگەر خۆی دابەشی بكات ئەوا دروستە، وە ئەگەر بيداتە پێشەوای ئيمانداران ئەوا دروستە .

**٩٣** - وَاعْلَمْ أَنَّ أَوَّلَ الإِسْلَامِ : شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .

**٩٣** - وە بزانە يەكـەم پايەی ئەم ئيسلامە : شايەتی دانە بەوەی كـە هيچ خودايەك نييە بە حەق كـە شايەنی پەرستن بێت جگە لە الله، وە محمد ﷺ يش بەندە و نێردراوی ئەوە .

---

**: مانای شايەتی لا إله إلا الله : باوەڕت بێ بە دڵت وزمانت بيڵێی و دانی پێدا بنێيت و بە كار و كردەوە بيسەلمێنيت كـە وا هيچ خودايەك نييە بە حەق كـە شايەنی پەرستن بێت جگە لە الله، هەرپەرستراوێك جگە لەو باطل و پوچەڵە.**

**مانای شايەتی محمد رسول الله : دان بەوەدا بنێيت بە ئاشكراو نهێنی كـەوا محمد ﷺ نێردراوی الله يە، بەڵام گەركـەسێك بە زمان گووتی ولە ناخيدا باوەڕی بە پەيامەكـەی نييە ئەوا دووڕووە .**

**٩٤** - وَأَنَّ مَا قَالَ اللهُ كَمَا قَالَ، وَلَا خُلْفَ لِمَا قَالَ، وَهُوَ عِنْدَ مَا قَالَ .

**٩٤** - ئەوەی الله فەرموویەتی هەر ئەوەیە کە ئەو فەرموویەتی، وە هەر بەڵێنێکی دابێت جێبەجێی دەکات و دەیباتە سەر .

: الله تعالی هەر بەڵێنێکی دابێت ئەوا هیچ پەشیمان نابێتەوە و جێبەجێی دەکات وەک الله تعالی فەرموویەتی : | **وَعْدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ** | ئەگەر هەڕەشەی دا ڕەنگە لێی خۆشنەبێ، چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان بەڵێن و هەڕەشە .

بەڵێن : هەرگیز الله لێی پەشیمان نابێتەوە .

بەڵام هەڕەشە : ڕەنگە هەڕەشەکە جێبەجێ نەکات و لێی خۆشبێ بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی، وە ڕەنگە جێبەجێی بکات لەسەری بە عەدلی خۆی .

**٩٥** - وَالإِيمَانُ بِالشَّرَائِعِ كُلِّهَا .

**٩٥** - وە باوەڕبوون بە هەموو شەریعەتەکان .

: واتە باوەڕ بوون بە هەموو ئەو شتانەی کە لە شەرعدا بۆمان دانراوە لە ڕێگەی قورئان فەرموودەوە، وەکو نوێژ و ڕۆژوو و جیهاد و حەج و . . .

**٩٦** - وَاعْلَمْ أَنَّ الشَّرَاءَ وَالبَيْعَ حَلالٌ إِذَا بِيعَ فِي أَسْوَاقِ المُسْلِمِينَ عَلَى حُكْمِ الكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، مِن غَيْرِ أَنْ يَدْخُلَهُ تَغْرِيرُ، أَوْ ظُلْمٌ، أَوْ جَوْرٌ، أَوْ خِلافُ لِلقُرْآنِ، أَوْ خِلافُ لِلْعِلْمِ .

**٩٦** - وه بزانه کڕین و فرۆشتن حەڵاڵە ئەگەر لە بازاڕی موسڵماناندا فرۆشرا لەسەر حوکمی قورئان و سوننەت، بەبێ ئەوەی خەڵەتاندن و ستەم و غەدری تێکەڵ بێت یان پێچەوانەی قورئان بێت، یاخود پێچەوانەی عیلم بێت .

---

: بەشێک لە سۆفیەکان لەو کاتەدا بە بیانوی زوهد و دنیانەویستیەوە دەیانوت ئیشکردن لە بازاڕو بازرگانی کردن جائیز نییە، هەرلەبەرئەو هۆکارە ئیمامی الخلال (٣١١ ھ) کتێبێکی نووسی بە ناوی (الحث على التجارة والصناعة والعمل) .

ئیمام حرب الكرماني لە **كتاب السنة** دا ئەڵێت :

**٨٥** - وە هەرکەسێک کارکردن و بازرگانی و داواکردنی ماڵ بەشێوازی خۆی حەڕام بکات - **واتە بڵێت تەنیا عیبادەت دەکەم کارناکەم** - ، ئەوا نەزانە، وە هەڵەی کردووە، وە پێچەوانەکارە، بەڵکو کارکردن بە شێوازی خۆی حەڵاڵە، بەڕاستی الله عزوجل و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە زانایانی ئوممەت حەڵاڵیان کردووە - **مەبەست لە زانا ئەوەیە کە ئەوانیش دەربارەی کارکردن قسەیان نەکردووە ئەگینا حەڵاڵ و حەرام بەدەست زانا نییە** - .

پێویسته لەسەر پیاو کە وا هەوڵ بدات بۆ بژێوی ژیانی خۆیی و خێزانەکەی، دەیەوێت فەزڵ و ڕەزامەندی پەروەردگاری بەدەست بێنێت، هەرکەسێک وازلەوە بێنێت دەربارەی ئەوەی کارکردن بە حەڵاڵ نازانێت ئەوا کەسێکی پێچەوانیکارە.

**٩٧** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللهُ أَنَّهُ يَنْبَغِي لِلعَبْدِ أَنْ تَصْحَبَهُ الشَّفَقَةُ أَبَدًا مَا صَحِبَ الدُّنْيَا، لأَنَّهُ لَا يَدْرِي عَلَى مَا يَمُوتُ، وَبِمَا يُخْتَمُ لَهُ، وَعَلَى مَا يَلْقَى اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، وَإِنْ عَمِلَ كُلَّ عَمَلٍ مِنَ الخَيْرِ، وَيَنْبَغِي لِلرَّجُلِ المُسْرِفِ عَلَى نَفْسِهِ أَلَّا يَقْطَعَ رَجَاءَهُ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى عِنْدَ المَوْتِ، وَيُحْسِنَ ظَنَّهُ بِاللهِ تَبَارَكَ وتَعَالى، وَيَخَافَ ذُنُوبَهُ، فَإِنْ رَحِمَهُ اللَّهُ فَبِفَضْلٍ، وَإِنْ عَذَّبَهُ فَبِذَنْبٍ.

**٩٧** - وە بزانە ڕەحمەتی اللە ت لێ بێ کەوا پێویستە هەردەم ترس هاوڕێی بەندە بێت تاکو لە دونیادایە، چونکە نازانێت لەسەر چی دەمرێت، وە بە چی کۆتایی بە ژیانی دێت، لەسەر چی شتێك ئەگەڕێتەوە اللە ی خۆی، هەرچەندە هەموو کارێکی باش ئەنجام بدات، وە پێویستە لەسەر کەسی زیادەڕەو لە تاوانکردندا هیوا و ئومێد لە اللە تعالی ی خۆی نەبڕێت لە کاتی مردندا، وە گومانی باش بە اللە تعالی ببات، ترسی ئاکامی تاوانەکەی هەبێ، جا ئەگەر اللە تعالی ڕەحمی پێ کرد ئەوە بە فەزڵی اللە یە، وە ئەگەر سزای بدات ئەوا بەهۆی تاوانەکانی خۆیەوەیەتی.

: مەبەستی ئەوەیە کە ئیماندار لە نێوان ترس و تکادا کۆبکاتەوە لە کارەکانیدا، واتە نابێت تەنیا بترسێت و بێ ئومێد بێت، وە نابێت ئەوەندە دڵنیا بێت کە بیرلە سزای الله ش نەکاتەوە.

زانایان دەڵێن: لە کاتی تەندرووستیدا لایەنی ترس زاڵ ببێت بەسەرتدا باشترە، وە لە کاتی مردندا لایەنی هیوا و ئومێد زاڵ ببێت بەسەرتدا باشترە.

چونکە لە کاتی ژیاندا دەتوانی کار بکەیت و تەوبە بکەیت بەڵام لە کاتی مردن ناتوانێ هیچ شتێک بکات بۆیە لایەنی ڕجا زاڵ ببێت باشترە، هەروەک لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (با هیچ کەسێک لە ئێوە نەمرێت ئیللا گومانی باشی بە الله هەبێت).

رواه مسلم

٩٨ - وَالإيمَانُ بِأَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وتَعَالى أَطْلَعَ نَبِيَّهُ ﷺ عَلَى مَا يَكُونُ فِي أُمَّتِهِ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ.

٩٨ - وە باوەڕبوون بەوەی کە الله تعالی هەموو ئەوەی دێت بەسەر ئوممەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ تاکو ڕۆژی قیامەت پیشان پێغەمەرەکەی ﷺ داوە.

٩٩ - وَاعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (سَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرَقَةٌ كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلَّا وَاحِدَةٌ، وَهِيَ الجَمَاعَةُ).

قِيلَ : مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟

قَالَ : (مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَومَ وَأَصْحَابِي) .

هَكَذَا كَانَ الدِّينُ إِلَى خِلَافَةِ عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ الجَمَاعَةُ كُلُّهَا، وَهَكَذَا فِي زَمَنِ عُثْمَانَ رضي الله عنه، فَلَمَّا قُتِلَ عُثْمَانُ جَاءَ الْاخْتِلَافُ وَالبِدَعُ، وَصَارَ النَّاسُ أَحْزَابًا، فَمِنَ النَّاسِ مَنْ ثَبَتَ عَلَى الحَقِّ عِنْدَ أَوَّلِ التَّغيِيرِ، وَقَالَ بِهِ، وَعَمِلَ بِهِ، وَدَعَا النَّاسَ إِلَيْهِ .

فَكَانَ الأَمْرُ مُسْتَقِيمًا حَتَّى كَانَتِ الطَّبَقَةُ الرَّابِعَةُ فِي خِلافَة بَنِي فُلَانٍ انْقَلَبَ الزَّمَانُ، وَتَغَيَّرَ النَّاسُ جِدًّا، وَفَشَتِ البِدَعُ، وَكَثُرَ الدُّعَاةُ إِلَى غَيْرِ سَبِيلِ الحَقِّ وَالجَمَاعَةِ، وَوَقَعَتِ المِحْنَةُ فِي شَيْءٍ لَمْ يَتَكَلَّمْ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَا أَحَدٌ مِنَ الصَّحَابَةِ، وَدَعَوْا إِلَى الفُرْقَةِ، وَقَدْ نَهَى رَسُولُ اللهُ عَنِ الْفُرْقَةِ، وَكَفَّرَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، وَكُلُّ دَعَا إِلَى رَأْيِهِ، وَإِلَى تَكْفِيرِ مَنْ خَالَفَهُ فَضَلَّ الْجُهَّالُ وَالرَّعَاعُ وَمَن لَا عِلْمَ لَهُ، وَأَطْمَعُوا النَّاسَ فِي شَيْءٍ مِن أَمْرِ الدُّنْيَا، وَخَوَّفُوهُمْ عِقَابَ الدُّنْيَا، فَاتَّبَعَهُمُ الخَلْقُ عَلَى خَوْفٍ فِي دُنْيَاهُمْ، وَرَغْبَةٍ فِي دُنْيَاهُمْ، فَصَارَتِ السُّنَّةُ وَأَهْلُ السُّنَّةِ مَكْتُومِينَ، وَظَهَرَتِ البِدْعَةُ وَفَشَتْ، وَكَفَرُوا مِنْ حَيْثُ لا يَعْلَمُونَ مِن وُجُوهِ شَتَّى، وَوَضَعُوا القِيَاسَ، وَحَمَلُوا قُدْرَةَ الرَّبِّ وَآيَاتِهِ وَأَحْكَامِهِ وَأَمْرِهِ وَنَهيِهِ عَلَى عُقُولِهِمْ وَآرَائِهِمْ، فَمَا وَافَقَ عُقُولَهُمْ قَبِلُوهُ، وَمَا لَم يوَافَق عُقُولَهُمْ رَدُّوهُ، فَصَارَ الإِسْلامُ غَرِيبًا، وَالسُّنَّةُ غَرِيبَةٌ، وَأَهْلُ السُّنَّةِ غُرَبَاءَ فِي جَوْفِ دِيَارِهِمْ .

**٩٩** - وه بزانه پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی : (ئوممەتەکەم دەبێتە حەفتاو سێ تاقم و فیرقەوە، هەمووی لە ئاگردایە تەنها یەکێکیان نەبێت ئەویش جەماعەتە) .

وترا : ئەی پێغەمەری الله ﷺ ئەوانە کێن؟

فەرمووی : (ئەوەی ئەمڕۆ من و هاوەڵانی لەسەرین) .

دینەکە بەمشێوەیە بوو تاکو خیلافەتی عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه لەسەر جەماعەت، وه لە سەردەمی عثمان رضي الله عنه دا هەر بەم شێوەیە بوو، کاتێ عثمان رضي الله عنه کوژرا، ئەوا جیاوازی و بیدعه هاتە کایەوە، خەڵکی بوونە چەند حیزب و گرووپێکەوە، جا لە خەڵکی هەبوون دامەزراو بوو لەسەر حەق هەر لە یەکەم گۆڕانکارییەوە، هەر ئەوەی دەوتەوە و کاری پێدەکرد و خەڵکی بۆ بانگ دەکرد .

دینەکە بە ڕاست و ڕێک و پێکی دەڕۆیشت تاکو چینی چوارەم پەیدابوو لە خیلافەتی بەنی فلان و زەمانە هەڵگەڕایەوە، وه خەڵکی زۆر گۆڕان، وه بیدعه بڵاوبۆوە، بانگەوازکاران بۆ ڕێگەی غەیری حەق و جەماعە زۆربوون، لەهەموو شتێکدا تاقیکردنەوە ڕوویدا، کە پێغەمبەری الله ﷺ قسەی تێدا نەکردبوو، وه هیچ هاوەڵێکیش قسەیان تێدا نەکردبوو .

بانگەوازیان کرد بۆ جیاوازی و دووبەرەکی لە کاتێک پێغەمبەری الله ﷺ نەهی لە دووبەرەکی کردووە، هەندێکیان ئەوانی تری کافر کرد و

هەریەکە بانگەشە بۆ بۆچوونی خۆی دەکات و بۆ بە کافر زانینی ئەوانەی ناکۆکن لەگەڵیاندا **[واتە هەریەکەیان کە بانگەشەیان دەکرد بۆ ئەوەبوو کە لای بەرامبەرکە ناکۆک بوون لەگەڵیان بە کافریان بزانن، تا لایەنی خۆی زاڵ بکات بەسەریدا]**، بۆیە نەفامان و خەڵکی عەوام و ئەوانەی علمیان نییە گومڕا بوون، طەماعیان دا بە خەڵکی بە شتی دونیا، بە سزای دونیا ئەوانیان ترساند، بۆیەش خەڵکی شوێنی ئەوان کەوتن لەترسی دینەکەیان و طەماعی ئەوەی لە دونیاکەیاندا هەیە **[واتە بۆیە شوێنی ئەوان دەکەوتن تاکو شتێکیان لە سەروەت و ماڵی دونیا دەست بکەوێت هەرچەندە لەسەرعەقیدەیەکی پووچ و باطل بن]**.

جا سوننەت و ئەهلی سوننەت شاراوە بوون و بیدعە دەرکەوت و بڵاوبۆوە، بەشێوەیەک کە نەیاندەزانی لە چەند ڕوویەکەوە کوفریان کرد و قیاسیان دانا، توانای پەروەردگار و ئایەتەکانی و ئەحکامەکانی و فەرمانەکانی و نەهییەکانی بە پێی عەقڵ و بۆچوونی خۆیان لێک دەدایەوە، جا ئەوەی لەگەڵ عەقڵی ئەواندا دەگونجا ئەوا وەریاندەگرت، وە ئەوەی لەگەڵ عەقڵیان نەدەگونجا ڕەددیان دەکردەوە، بۆیە ئیسلام نامۆ بوو، سوننەتیش نامۆ بوو، وە ئەهلی سوننە شوێنەکانی خۆیاندا نامۆ بوون .

**١٠٠** - وَاعْلَمْ أَنَّ المُتْعَةَ مُتْعَةَ النِّسَاءِ والاسْتِحْلالَ حَرَامٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ .

**١٠٠** - وە بزانە متعة و حەڵاڵکردنی حەرامە تاکو ڕۆژی قیامەت .

: موتعه ئەوەیە کە ڕافیزەکان دەیکەن وپێی دەڵێن سیغه، و اته بۆ ماوەیەکی کاتی لەگەڵ ئافرەتێکدا ڕادەبوێرن و دوا تر تەڵاقی دەدەن، ئەمەش لەڕاستیدا زینایە بەڵام ناوەکەیان گۆڕیوە، تەنها ئەوەندە .

**١٠١** - وَاعْرِفْ لِبَنِي هَاشِمٍ فَضْلَهُمْ لِقَرَابَتِهِمْ مِن رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَتعْرِفْ فَضْلَ قُرَيْشٍ وَالعَرَبِ وَجَمِيعِ الأَفْخَاذِ، فَاعْرِفْ قَدْرَهُمْ وَحُقُوقَهُمْ فِي الإِسْلامِ؛ وَمَوْلَى القَوْمِ مِنْهُمْ، وَتَعَرَّفْ لِسَائِرِ النَّاسِ حَقَّهُمْ فِي الإِسْلامِ، وَاعْرِفْ فَضْلَ الأَنْصَارِ، وَوَصِيَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيهِمْ، وَآلَ الرَّسُولِ فَلَا تَسُبَّهُمْ وَاعْرِفْ فَضْلَهُمْ وَكَرَامَاتِهِمْ، وَجِيرَانُهُ مِن أَهْلِ الْمَدِينَةِ فَاعْرِفْ فَضْلَهُمْ .

**١٠١** - وە فەزڵی بەنی هاشم بزانە، لەبەر نزیکیان لە پێغەمبەری الله وە ﷺ، وە فەزڵی قورەیش و عەرەب هەموو تیرەکان بزانە، جا قەدر و مافیان بزانە لە ئیسلامدا، وە مەولای هەر قەومێك هەر لە خۆیانە و حەقی هەموو خەڵکی بزانە لە ئیسلامدا .

فەزڵی پشتیوانان بزانە، وە ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری الله ﷺ لەواندا بزانە، وە فەزڵی بنەماڵەی پێغەمبەری الله ﷺ بزانە و هەرگیز جوێنیان پێ مەدە، وە فەزڵ و کەڕامەتیان بزانە، وە دراوسێکانی لە ئەهلی مەدینەش ئەوا فەزڵی ئەوانیش بزانە .

: مەولا و اته بەندەی ئازادكراو.

**١٠٢** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّه أَنَّ أَهْلَ العِلْمِ لَمْ يَزَالُوا يَرُدُّونَ قَوْلَ الْجَهْمِيَّةِ، حَتَّى كَانَ فِي خِلَافَةِ بَنِي فُلان، تَكَلَّمَتِ الرُّوَيبْضَةُ فِي أَمْرِ العَامَّةِ، وَطَعَنُوا عَلَى آثَارِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَخَذُوا بِالقِيَاسِ وَالرَّأْيِ، وَكَفَرُوا مَن خَالَفَهُمْ، فَدَخَلَ فِي قَوْلِهِمُ الجَاهِلُ وَالمُغَفَّلُ، وَالذِي لَا عِلْمَ لَهُ، حَتَّى كَفَرُوا مِن حَيْثُ لا يَعْلَمُونَ، فَهَلَكَتِ الأُمَّةُ مِنْ وُجُوه، وَكَفَرَتْ مِن وُجُوهِ، وَتَزَنْدَقَتْ مِن وُجُوهِ، وَضَلَّتْ مِن وُجُوهِ، وَتَفَرَّقَتْ وَابْتَدَعَتْ مِن وُجُوهِ، إِلَّا مَن ثَبَتَ عَلَى قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَمْرِهِ وَأَمْرِ أَصْحَابِهِ، وَلَمْ يُخطِّيء أَحَدًا مِنْهُمْ، وَلَمْ يُجَاوِزْ أَمْرَهُمْ، وَوَسِعَهُ مَا وَسِعَهُمْ، وَلَمْ يَرْغَبْ عَنْ طَرِيقَتِهِمْ وَمَذْهَبِهِمْ وَعَلِمَ أَنَّهُم كَانُوا عَلَى الإِسْلَامِ الصَّحِيحِ، وَالإِيمَانِ الصَّحِيحِ، فَقَلَّدَهُم دِينَهُ وَاسْتَرَاحَ، وَعَلِمَ أَنَّ الدِّينَ إِنَّمَا هُوَ بِالتَّقْلِيدِ، وَالتَّقْلِيدُ لأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ .

**١٠٢** - وە بزانە ئەهلی عیلم بەردەوام ڕەددی قسەی جەهمییەكانیان دەدایەوە، تاكو سەردەمی خیلافەتی بەنی فڵان **[مەبەستی المأمون ی خەلیفەی جەهمی عەباسیەكانە]** هات و سوكەكان قسەیان كرد لە كاروباری گشتی دا، تانەیان دا لە فەرموودەكانی پێغەمبەری الله ﷺ، و قیاس و بۆچوونیان دانا و ئەوانەی جیاواز بوون لەگەڵیاندا بە كافریان دەزانی.

بۆیە خەڵکی نەفام و بێ ئاگا، وە ئەوانەی علمیان نییە چوونە سەر ڕای ئەوان، تاکو کافر بوون بەشێوەیەک ئاگایان لە خۆیان نەبوو **[ئەمەش ڕەددە بۆ ئەوانەی دەڵێن کەسێکی جاهیلی جەهمی ڕاستەوخۆ تەکفیر ناکرێت]**، بۆیە ئەم ئوممەتە بە هەلاکەتدا چوو، لە چەند ڕوویەکەوە کوفریان کرد، وە لە چەند ڕوویەکەوە زەندیق بوون، لە چەند ڕوویەکەوە گومڕا بوون، جیاواز بوون و بیدعەیان کرد لەچەند ڕوویەکەوە، ئیللا ئەوانە نەبێ دامەزراو بوون لەسەر قسەی پێغەمبەری الله ﷺ فەرمانی ئەو و فەرمانی هاوەڵانی، قسەیان پێش هیچ یەکێک لەوان نەکرد و لە فەرمانی ئەوان تێنەپەڕین، وە ئەوەی ئەوان ووتیان هەر ئەوەندەیان بەسە بوو، ڕقییان لە ڕێگا و مەزهەبی ئەوان نەبوو، وە زانیان کە وا ئەوان لەسەر ئیسلام و ئیمانی ڕاست و تەواو بوون، بۆیە لە دینەکەیدا چاوی لەوان کرد و بێ خەم بوو، زانی کە وا دین بریتییە لە چاولێکردن، چاولێکردن و لاسایی کردنەوەی هاوەڵانی محمد ﷺ .

---

**: ئیمام حرب الكرماني لە كتاب السنة دا ئەڵێت :**

**٨٩ - هەرکەسێک پێی وابێت کەوا نابێت شوێن هیچ کەسێک بکەویت، وە دینەکەی شوێنکەوتەی هیچ کەسێک نەبێت [وەک شوێنکەوتەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ، و تابعين و اتباعی تابعين] ، ئەمە وتەی فاسق و بیدعەچییە، دوژمنە بۆ الله و رسولەکەی ﷺ، وە دینەکەی، وە بۆ کتێبەکەی، وە بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ .**

بەمە دەیەوێت أثر پووچ و بەتاڵ بکاتەوە، وە زانست و علم پەک بخات، وە ڕووناکی سوننەت بکوژێنێتەوە، وە تاک و دەگمەن بێ لە ڕەئی و بیروبۆچوون و قسە و بیدعە و خیلاف و دووبەرەکی .

لەعنەتی الله و فریشتەکان و گشت خەڵکی، لەو کەسە بێت کە ئەو قسەیە دەکات .

ئا ئەمە پیسترین وتەی بیدعەچییەکانە، وە نزیکترینە لە گومڕایی و تیاچوون، بەڵکو ئەوە گومڕاییە، ئەوەی پێی وابێت کە نابێت شوێنکەوتەی هیچ کەس بیت، وە ئەمانە دینەکەیان شوێنکەوتەی أبا حنیفة و بشر المریسي و هاوەڵاکانیەتی [واتە ئەوانەی کە پێیان وایە نابێت شوێنکەوتەی هیچ کەسێک بیت، ئەوا ئەوانە دینەکەیان شوێنی أبا حنیفة و بشر المریسي و هاوەڵەکانی ئەمانەیە].

کێ لەو کەسە دوژمنترە بۆ الله کە دەیەوێت ڕووناکی سوننەت بکوژێنتەوە، وە ئاثار و ڕیوایەتەکان پوچەڵ بکاتەوە، وە پێی وابێت کە نابێت شوێن هیچ کەس بکەویت، وە دینەکەی شوێنی ئەوە کەوتووە کە لەپێشوو ناوم هێنان بۆت [مەبەست پێی ئەوانەی ناوی هێناوە : أبا حنیفة و بشر المریسي و هاوەڵەکانی، والله اعلم] ، ئەمانە پێشەوایی گومڕان، وە سەرانی بیدعەچییەکانن، وە سەرۆکی پێچەوانەکارانن .

تورەیی الله دابەزێتە سەر خاوەنی ئەم قسەیە [تەقلید لای سەلەف و پێشەوایان سوننەت واتە شوێنکەوتنی ئاثار و هاوەڵان رضوان الله علیهم، وە هەرچی ئەوان موافقەیان کردووە لە زانایانی سەلەف، کە ئەمەش تەقلیدێکی چاکە و خۆشویستراوە .

بەڵام ئەو تەقلیدەی کە ڕێگری لێکراوە لای زانایانی سەلەف ئەوەیە کە تەقلیدی شتێ بکەیت و شوێنی بکەویت بێ بوونی هیچ بەڵگەیەک و ئەثەرێک] .

**١٠٣** - وَمَن قَالَ : لَفْظِي بِالقُرْآنِ مَخْلُوقٌ فَهُوَ جَهْمِيٌّ، وَمَن سَكَتَ فَلَمْ يَقُلْ : مَخْلُوقٌ أَوْ غَيْرُ مَخْلُوقٍ، فَهُو جَهْمِيٌّ، هَكَذَا قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ .

**١٠٣** - وه هەر كەسێك بڵێت : لەفزم بە قورئان دروستكراوە ئەوە جەهمییە **[ئەوەی لە دەمی كەسەكەوە دێتە دەرەوە هەر قورئانە قورئانیش درووستكراو نییە]**، هەر كەسێك بێ دەنگ بوو نەیوت : دروستكراوە یان دروستكراو نییە ئەویش جەهمییە، ئەحمەدی كوڕی حەنبەل وای وتووە .

---

**: ئیمام حرب الكرماني لە كتاب السنة دا ئەڵێت :**

**٩٧ - الو اقفية : ئەو انەن كە برِو ایان و ایە و دەڵێن : قورئان كەلام ووتەی الله یە، وە ناڵێین درووستكراو نییە .**

**وە ئەوان خر اپترین و پیسترین جۆرن .**

**٩٨ - اللفظيّة : ئەو انەن كە پێیان و ایە و دەڵێن : قورئان كەلام و وتەی الله یە، بەڵام قسەكردنمان پێی و دەربڕینمان بۆ لەفزەكانی قورئان و تیلاوەت و خوێندنەوەمان بۆی درووستكراوە .**

**ئەو انە جەهمی و زۆرفاسقن و دەرچوون لە فەرمانی الله .**

**١٠٤** - وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (إِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُم بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا فَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ، فَإِنَّهَا ضَلالَةٌ، وَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ؛ عَضُوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ) .

**١٠٤** - پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی : (هەرکەس لە ئێوە لە پاش من بژیەت ئەوا جیاوازی و دووبەرەکی زۆر دەبینێت، خۆتان لە داهێنراوەکان بەدوور بگرن، چونکە هەموو بیدعەیەک گومڕاییە، جا دەست بە سوننەت و ڕێگاکەی منەوە بگرن، وە دەست بە سوننەت و ڕێگای جێنشینەوە ڕێنمونی کراوەکانەوە بگرن، توند دەستی پێوە بگرن، بە ددانەکانتان توند بیگرن) .

**١٠٥** - وَاعْلَمْ أَنَّهُ إِنَّمَا جَاءَ هَلَاكُ الجَهْمِيَّةِ أَنَّهُمْ فَكَّرُوا فِي الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ فَأَدْخَلُوا : لِمَ؟ وَكَيْفَ؟ وَتَرَكُوا الأَثَرَ، وَوَضَعُوا القِيَاسَ، وَقَاسُوا الدِّينَ عَلَى رَأْيِهِمْ، فَجَاءُوا بِالكُفْرِ عِيَانًا لا يَخْفَى أَنَهُ كُفر، وَكَفَّرُوا الخَلْقَ، وَاضْطَرَّهُمُ الْأَمْرُ حَتَّى قَالُوا بِالتَّعْطِيلِ .

**١٠٥** - وە بزانە کە وا بە هەلاکەت چوونی جەهمییەکان بەهۆی ئەوەوە بوو بیریان لە پەروەردگار کردەوە، چەند پرسیارێکیان هێنایە ئاراوە وەک : بۆ؟ چۆن؟ وازیان لە فەرموودە هێنا، قیاسیان دانا، قیاسی دینیان بە بۆچوونی خۆیان کرد، بۆیە بە ئاشکرایی کوفریان هێنایە کایەوە و

ناشاردرێتەوە کە ئەوە کوفرە، جا خۆیان کافر بوون و خەڵکیشیان کافر کرد و بۆچوونەکانیان وای لێ کردن تاکو لە کارخستنیان هێنایە کایەوە.

---

: ئیمام حرب الكرماني لە **كتاب السنة** دا ئەڵێت :

**٩٦ - الجهمية : دوژمنی الله ن، ئەوانەن کە پێیان وایە قورئان دروستکراوە - مخلوق - ، وە پێیان وایە الله قسەی لەگەڵ موسى عليه السلام نەکردووە، وە الله قسە ناکات ونابینرێ، وە شوێنی الله نازانرێت، وە الله عەرش وکورسی نییە، وە قسە گەلێکی زۆرکە رِقم لێیە بیگێڕمەوە.**

**ئەوانە کافروزەندیقن دوژمنی الله ن ئاگاداریان بە.**

١٠٦ - وَقَالَ بَعْضُ العُلَمَاءِ مِنْهُم الإِمَامِ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: الْجَهْمِيُّ كَافِرٌ، لَيْسَ مِنْ أَهْلِ القِبْلَةِ، حَلالُ الدَّمِ، لَا يَرِثُ، وَلَا يُورَثُ، لَأَنَّهُ قَالَ: لَا جُمُعَةَ، وَلَا جَمَاعَةَ، وَلَا عِيدَينِ وَلا صَدَقَةَ، وَقَالُوا: مَن لَمْ يَقلِ: القُرْآنُ مَخْلُوقٌ؛ فَهُوَ كَافِرٌ! واستَحَلوا السَيفَ على أُمةِ محمد ﷺ، وخالَفوا مَن كان قَبلَهُم، وامتَحَنوا الناسَ بِشَيءٍ لَم يَتَكَلم فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَلا أحدٌ من أصحابِهِ، وَأرادوا تَعطِيل المَساجِد وَالجَوامِع، وَأَوْهَنُوا الإِسْلامَ، وَعَطَّلُوا الجِهَادَ، وَعَمِلُوا فِي الْفُرْقَةِ، وَخَالَفُوا الْآثَارَ، وَتَكَلَّمُوا بِالْمَنْسُوخِ، وَاحْتَجُوا بِالْمُتَشَابِهِ، فَشَكَّكُوا النَّاسِ فِي أَدْيَانِهِمْ، وَاخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ، وَقَالُوا: لَيْسَ عَذَابُ قَبْرٍ، وَلَا حَوْضُ، وَلَا شَفَاعَةٌ، وَالجَنَّةُ وَالنَّارُ لَمْ تَخْلُقَا، وأَنْكَرُوا كَثِيرًا مِمَّا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاسْتَحَلَّ مَنِ اسْتَحَلَّ تَكْفِيرَهُمْ وَدِمَاءَهُمْ

مِن هَذَا الوَجْهِ؛ لأَنَّهُ مَنْ رَدَّ آيَةٌ مِنْ كِتَابِ اللَّه فَقَدْ رَدَّ الْكِتَابَ كُلَّهُ، وَمَن رَدَّ أَثَراً عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فقَد رَدَّ الأَثَرَ كُلَّهُ، وَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّه العظيم، فَدَامَتْ لَهُمُ المُدَّةُ، وَوَجَدُوا مِنَ السُّلْطَانِ مَعُونَةٌ عَلَى ذَلِكَ، وَوَضَعُوا السَّيْفَ وَالسَّوْطَ مَن دُونَ ذَلِكَ، فَدَرَسَ عِلْمُ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ وَأَوهَنُوهُمَا، وَصَارِنَا مَكْتُومَتَيْنِ الإِظْهَارِ البِدَعِ وَالكَلامِ فِيهَا، وَلَكَثْرَتِهِمْ، وَاتَّخَذُوا المَجَالِسَ وَأَظْهَرُوا رَأْيَهُمْ، وَوَضَعُوا فِيهِ الكُتُبَ، وَأَطْمَعُوا النَّاسَ، وَطَلَبُوا لَهُم الرِّئَاسَةَ، فَكَانَتْ فِتْنَةٌ عَظِيمَةٌ، لَمْ يَنْجُ مِنْهَا إِلَّا مَن عَصَمَ اللَّه، فَأَدْنَى مَا كَانَ يُصِيبُ الرَّجُلَ مِن مُجَالَسَتِهِم أَن يَشُكَّ فِي دِينِهِ، أَوْ يُتَابِعَهُمْ، أَوْ يرَى رَأْيَهُمْ عَلَى الحَقِّ، وَلَا يَدْرِي أَنَّهُ عَلَى الحَقِّ، أَوْ عَلَى البَاطِلِ، فَصَارَ شَاكًا، فَهَلَكَ الخَلْقُ حَتَّى كَانَ أَيَّامَ جَعْفَرِ الَّذِي يُقَالُ لَهُ المُتَوَكِّلُ ؛ فَأَطْفَأَ اللَّهُ بِهِ البِدَعَ، وَأَظْهَرَ بِهِ الحَقَّ، وَأَظْهَرَ بِهِ أَهْلَ السُّنَّةِ، وَطَالَتْ أَلْسِنَتُهُمْ، مَعَ قِلَّتِهِمْ وَكَثْرَةِ أَهْلِ البِدَعِ إِلَى يَوْمِنَا هَذَا، وَالرَّسْمُ وَأَعْلَامُ الضَّلَالَةِ قَدْ بَقِيَ مِنْهُمْ قَوْمٌ يَعْمَلُونَ بِهَا، وَيَدْعُونَ إِلَيْهَا، لا مَانِعَ يَمْنَعُهُمْ، وَلَا أَحَدَ يَحْجُزُهُمْ عَمَّا يَقُولُونَ وَيَعْمَلُونَ .

**١٠٦** - وە هەندێ لە زانایان لەوانە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتویانە : جەهمی کافرە، ئەهلی قیبلە نییە، خوێنی حەڵاڵە، لە میرات هیچ وەرناگرێ، وە ماڵەکەی نابێتە میرات، لەبەرئەوەی وتیان : نە جومعە و نە جەماعەت، وە نەدوو جەژن، وە نە صەدەقە **هەیە [جەهمیەکان ئینکاری نوێژی جومعە وجەماعەت وجەژن دەکەن لەبەرئەوەی خۆیان بیدعە وکوفرێکیان داهێناوە وهەر کەسێک هەمان عەقیدەی کوفری ئەوانی نەبێت بە کافری ئەزانن، هەربۆیە نوێژی لە پشتەوە ناکەن ووازلە جەماعەتی موسوڵمانان ئەهێنن]** .

هەروەها دەڵێن : هەرکەسێ نەڵێت : قورئان دروستکراوە ئەوا کافرە، **[پێیان وایە قورئان مەخلوقە وئینکاری سیفەتی کەلام دەکەن بۆ الله تعالى، عەقیدەی ئەهلی سوننە وجەماعەت ئەوەیە کە الله سیفەتی کەلامی هەیە وە قورئان کەلامی الله یە ومەخلوق نییە]**، شمشێریان لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ حەڵاڵ کرد، لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیاندا جیاوازبوون، خەڵکیان تاقی دەکردەوە لە شتێکدا کە پێغەمبەری الله ﷺ و هاوەڵانی قسەیان تیادا نەکردووە، ویستیان مزگەوتەکان و نوێژی جەماعەت لەکار بخەن .

بوونە هۆی لاوازبونی ئیسلام، جیهادیان لەکارخست کاریان بۆ پارچە پارچەکردنی موسڵمان کرد، پێچەوانەی فەرموودە و ئاثارەکانیان کرد، کاریان بە منسوخ کان کرد، وە بەڵگەی متشابهەکان یان کردە حوججە، بۆیە گومانیان خستە ناو دڵی خەڵکییەوە لە دینەکەیاندا، وە دژایەتی پەروەردگاریان کرد و وتیان : سزای ناوگۆڕ بوونی نییە، وە حەوز و شەفاعەت نییە بەهەشت و دۆزەخ دروست نەکراون، زۆربەی ئەوانەی پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی ئینکاریان لێ کرد، بۆیە ئەوانەی بە کافریان دەزانن خوێنی ئەوانەیان حەڵاڵ کرد لەم ڕووەوەیە، چونکە هەرکەسێ یەك ئایەت لە قورئان ڕەتبکاتەوە ئەوا هەموو قورئانی ڕەتکردۆتەوە، وە هەرکەسێ یەك فەرموودە ڕەتبکاتەوە ئەوا هەموو فەرموودەکانی ڕەتکردۆتەوە، ئەویش کافرە بە الله تعالى .

ماوەیەك ڕۆژگار بۆ ئەوان بوو لەلایەن دەسەڵاتەوە یارمەتی دەریان هەبوو بۆ بڵاوكردنەوی ڕەئیەكەیان، بە شمشێر و قامچی و بێجگە ئەوانیان بەكاردەهێنا، بۆیە عیلمی سوننە و جەماعە پەرت وبڵاو بووەوە لاوازیان كردن، ئەهلی سوننە و جەماعە شاراوە و نادیار بوون لەبەر دەركەوتنی بیدعە و كەلام لەمەسەلەكاندا، وە لەبەر ژمارە زۆرییان و چەندان مەجلیسیان داناو بۆچوونی خۆیان دەرخست، وە چەندین كتێبیان لەو بابەتەدا نووسی، تەماحیان خستە بەر خەڵكی و سەرۆكایەتی و دەسەڵاتیان بۆ ئەوان دەویست، بۆیە فیتنەیەكی گەورە بوو، هیچ كەسێك لێی دەرباز نەبوو ئیللا ئەوانە نەبێ كە الله تعالی پاراستنی، كەمترین شت تووشی پیاوێك دەبوو لە مەجلیسەكانی ئەواندا ئەوە بوو گومانی لە دینەكەیدا بۆ دروست دەبوو، یان شوێنی ئەوان دەكەوت، یان وایدەزانی ڕەئی و بۆچوونی ئەوان حەقە، وە نەیدەزانی خۆی لەسەر حەقە یان لەسەر باتڵە، بۆیە هەمیشە گومانی هەبوو، خەڵكی بەهەلاكەتدا چوون تاكو سەردەمی جەعفەر كە پێیان دەوت المتوكل، الله تعالی بەهۆی ئەووەوە ئاگری بیدعە كوژاندەوە، وە حەقی دەرخست، وە ئەهلی سوننە بەهۆیەوە دەركەوتن و زمانیان توونند بوو **[و اتە بەقسەكانیان توند بوون لەسەرئەهلی بیدعە ووەك لەپێشوو زیاتر دەیانتوانی قسە بكەن]** هەرچەندە خۆیان كەم بوو و ئەهلی بیدعە زۆربوون تاكو ئەمڕۆ .

شوێنەوار و بانگشەکانی گومڕاکان مایەوە کۆمەڵێک لەوان مایەون کاری پێ دەکەن، وە بانگەوازیان بۆ دەکەن، هیچ کەسێک نییە ڕێگریان لێ بکات، هیچ کەسێک نییە ڕێگرییان لێبکات لەوەی دەیڵێن و دەیکەن .

**١٠٧** - وَاعْلَمْ أَنَّهُ لَمْ تَجِئْ بِدعَة قَطُّ إِلَّا مِنَ الهَمَجِ الرِّعَاعِ، أَتْبَاعِ كُلِّ نَاعِقٍ، يَمِيلُونَ مَعَ كُلِّ رِيحٍ، فَمَنْ كَانَ هَكَذَا فَلَا دِينَ لَهُ .

قَالَ اللَّه تَبَارَكَ وتَعَالى : | **فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(الجاثية : ١٧)** .

وَقَالَ : | **وَمَا تَفَرَّقُوا إلا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(الشورى : ١٤)** .

وَقَالَ : | **وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(البقرة : ٢١٣)**، وَهُمْ عُلَمَاءُ السُّوءِ أَصْحَابُ الطَّمَعِ وَالبِدَعِ .

**١٠٧** - وە بزانە هەرگیز زەندەقە پەیدا نەبووە ئیللا لە ناکەسبەچە و خراپەکارانەوە نەبێ کە شوینکەوتووانی هەموو بانگەوازێکن، لەگەڵ هەموو بایەکیدا لاردەبنەوە، جا هەر کەسێک وابوو ئەوا دینی نییە .

اللَّه تَبَارَكَ وتَعَالى دەفەرمووێت : | **فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(الجاثية : ١٧)** .

وە دەفەرمووێت : | **وَمَا تَفَرَّقُوا إِلا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(الشورى : ١٤)** .

وە دەفەرمووێت : | **وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(البقرة : ٢١٣)**، ئەوانیش زانای خراپ وخاوەنی تەماح و بیدعەن .

**١٠٨ -** وَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا يَزَالُ النَّاسُ فِي عِصَابَةٍ مِن أَهْلِ الحَقِّ وَالسُّنَّةِ، يَهْدِيهِمُ اللَّه، وَيَهْدِي بِهِم غَيْرَهُمْ، وَيُحِيي بِهِمُ السُّنَنَ، فَهُمُ الَّذِينَ وَصَفَهُمُ اللَّه تَعَالَى مَعَ قِلَّتِهِمْ عِنْدَ الاخْتِلافِ فَقَالَ : | **وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ** | **(الجاثية : ١٧)** .

فَاسْتَثْنَاهُمْ فَقَالَ : | **فَهَدَى اللَّه الَّذِينَ ءَامَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّه يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيم** | **(البقرة: ٢١٣)** .

وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (لا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّه وَهُمْ ظَاهِرُونَ) .

**١٠٨ -** وە بزانە کۆمەڵێکی خەڵکی بەردەوام لە ئەهلی حەق و سوننەتن، اللّٰه تعالی ڕێنموییان دەکات، وە بەهۆی ئەوانەوە کەسانی تریش هیدایەت وەردەگرن، وە سوننەتەکان زیندوو دەکەنەوە، ئەوانەن کە اللّٰه تعالی وەسفی کردوون لەکاتی جیاوازیدا هەرچەندە کەمن، فەرموویەتی : |

وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ | (الجاثية : ١٧) .

جا جیای كردنەوە [واتە ئەهلی حەق جیا كردەوە] و فەرمووی : | فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ | (البقرة: ٢١٣) .

هەروەها پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی : (بەردەوام كۆمەڵێك هەن لە ئوممەتی من لەسەر حەق ئاشكرا و ڕوونن، هیچ زەرەریان پێ ناگەیێنێت ئەوەی پشتیان لێ ئەكات، تاكو فەرمانی الله دێت ڕۆژی قیامەت لەسەر حەق ئاشكرا و ڕوون دەمێننەوە) .

---

لە كتێبی (شرف أصحاب الحديث) هاتووە :

٤١ - ئیمام یزید بن هارون رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەڵێت : (ئەگەر هاوەڵانی فەرموودە نەبن [واتە ئەهلی سوننە و جەماعە]، ئەوە نازانم كێن) .

٤٢ - ئیمام عبدالله بن المبارك رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەڵێت : (لەلای من ئەوانە هاوەڵانی فەرموودەن) .

٤٣ - ئیمام أحمد بن حنبل رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەڵێت : (ئەگەر هاوەڵانی فەرموودە نەبن، ئەوە نازانم كێن) .

٤٤ - ئیمام أحمد بن سنان رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەڵێت : (ئەوانە هاوەڵانی فەرموودە و ئاثارەكانن) .

**٤٥ - ئيمام علي بن المديني رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەڵێت : (ئەوانە هاوەڵانی فەرموودەن) .**

**٤٦ - ئیمام البخاري رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە ئەڵێت : (واتە هاوەڵانی فەرموودەن) .**

**١٠٩ - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّهُ أَنَّ العِلْمَ لَيْسَ بِكَثْرَةِ الرِّوَايَةِ وَالكُتُبِ، وَإِنَّمَا العَالِمُ مَنِ اتَّبَعَ العِلْمَ والسُّنَنَ، وَإِنْ كَانَ قَلِيلَ العِلْمِ وَالكُتُبِ، وَمَن خَالَفَ الكِتَابَ وَالسُّنَّةَ فَهُوَ صَاحِبُ بِدْعَةٍ وَإِنْ كَانَ كَثِيرَ العِلْمِ وَالكُتُبِ .**

**١٠٩** - وە بزانە ڕەحمەتی اللە ـت لێ بێت کە وا عیلم بە زۆری کتێب و ڕیوایەت نییە، بەڵکو زانا ئەو کەسەیە شوێنی عیلم وسوننەتەکان دەکەوێت، هەرچەندە عیلم و کتێبی کەم بێت، هەر کەسێک پێچەوانەی کیتاب و سوننەت بوو ئەوا خاوەنی بیدعەیە هەرچەندە زانست و کتێبی زۆر بێت .

---

**إبراهيم الخواص لە (سير سلف الصالحين : ١٣٢٥/٣) ئەڵێت :**

**(زانست بە زۆریی ڕیوایەت کردن نییە، بەڵکو زانست بۆ کەسێکە کە شوێن زانست ئەکەوێت و بەکاریئەهێنێت، وە شوێن سوننەتەکان ئەکەوێت ئەگەرچی زانستیشی کەم بێت).**

قوام السنة الأصبهاني له **(الحجة في بيان المحجة : ٢/٥٠٤)** ئەڵێت :

(ئەهلی سوننە ئەڵێن زانست بە زۆری ڕیوایەتکردن نییە، بەڵکو بە شوێنکەوتن و بەکارهێنانیەتی، شوێنی هاوەڵان و تابیعین بکەوێت ئەگەرچی زانستیشی کەم بێت، وە هەر کەسێک پێچەوانەی هاوەڵان و تابیعین بکات ئەوە گومڕایە ئەگەرچی زانستیشی زۆربێت) .

إسحاق بن راهويه له **(السنة لـ الخلال : ٢١٧٩)** ئەڵێت :

(ئێمە شوێنکەوتە و لاساییکەرەوەی پێشەوا و سەلەفە تێپەڕیوەکانمانین ڕەحمەتی الله یان لێبێت، شتێک داناهێنین کە لە قورئان و سوننەتی رسول الله ﷺ و وتەی ئیمامێکدا نەبێت) .

السجزي له **(الرسالة إلى أهل زبيد)** ئەڵێت :

(شوێنکەوتووی ئەثەر ئەبێت پێشبخرێت و ڕێزی لێ بگیردرێت، ئەگەرچی لە تەمەندا بچووک بێت، وە خاوەنی ڕەچەڵەکێکی بەناوبانگ نەبێت، وە پێچەوانیکاری ئەثەر ئەبێت دووربخرێتەوە ئەگەرچی تەمەنی گەورە بێت و لە خاوەن ڕەچەڵەکێکی بەناوبانگ بێت) .

**١١٠** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّه أَنَّ مَن قَالَ فِي دِينِ اللَّه بِرَأْيِهِ وَقِيَاسِهِ وَتَأْوِيلِهِ مِن غَيْرِ حُجَّةٍ مِنَ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَةِ فَقَدْ قَالَ عَلَى اللَّه مَا لَا يَعْلَمُ، وَمَن قَالَ عَلَى اللَّه مَا لَا يَعْلَمُ فَهُوَ مِنَ المُتَكَلِّفِينَ .

**١١٠** - وە بزانە ڕەحمەتی الله ت لێ بێت هەر کەسێک لەدینی الله دا بە بۆچوون و قیاس و تەئویلی خۆی قسەی کرد بەبێ هیچ بەڵگەیەك لە سوننەت و جەماعەدا، ئەوا بەناوی الله وە قسەی کردووە بەبێ عیلم، وە هەر

کەسێک بەناوی اللە وە قسە بکات بەبێ عیلم، ئەوە یەکێکە لە زۆر لەخۆکردووەکان .

**١١١** - وَالحَقُّ مَا جَاءَ مِن عِنْدِ اللَّهِ، وَالسُّنَّةُ : سُنَّةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالجَمَاعَةُ : مَا اجْتَمَعَ عَلَيْهِ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي خِلَافَةِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ .

وَمَنِ اقْتَصَرَ عَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمَا كَانَ عَلَيْهِ أَصْحَابُهُ وَالجَمَاعَةُ فَلَجَ عَلَى أَهْلِ البِدَعِ كُلِّهَا، وَاسْتَرَاحَ بَدَنُهُ وَسَلِمَ لَهُ دِينُهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ؛ لَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ : (سَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي) .

وَبَيَّنَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاجِي مِنْهَا فَقَالَ : (مَا كُنْتُ أَنَا عَلَيْهِ اليَوْمَ وَأَصْحَابِي) .

فَهَذَا هُوَ الشَّفَاءُ وَالبَيَانُ وَالْأَمْرُ الوَاضِحُ، وَالمَنَارُ المُسْتَنِيرُ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (إِيَّاكُمْ وَالتَّعَمُّقَ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَطُّعَ، وَعَلَيْكُمْ بِدِينِكُم العَتِيقِ) .

**١١١** - وە حەقیش ئەوەیە لەلایەن اللە تعالی وە هاتبێ، وە سوننەتیش : سوننەتی پێغەمبەری اللە ﷺ یە، وە جەماعەت یش : ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری اللە ﷺ لەسەری کۆبوونەوە لەخیلافەتی ئەبو بەکر و عومەر و عثماندا رضي اللە عنهم أجمعين .

وە هەر کەسێک بە تەنها دەستی گرت بە سوننەتەکەی پێغەمبەری اللە ﷺ، وە ئەوەی هاوەڵان و جەماعەت لەسەری بوون، ئەوا زاڵ دەبێت بەسەر هەموو ئەهلی بیدعەدا، جەستەی ئاسوودە دەبێ و دینەکەی سەلامەت دەبێ إن شاء اللە، چونکە پێغەمبەری اللە ﷺ فەرموویەتی: (ئوممەتەکەم جیاواز و ناکۆك دەبن).

پێغەمبەری اللە ﷺ کۆمەڵە ڕزگاربووەکەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە فەرمووی: (ئەوەی ئەمڕۆ من و هاوەڵانمی لەسەرین).

جا ئەمە چارەسەر و ڕوونکردنەوە و کارە ڕوونەکەیە، وە مەنارە ڕوناکەکەیە، پێغەمبەری اللە ﷺ فەرموویەتی: (خۆتان بپارێزن لە ڕۆچوون، وە خۆتان بپارێزن لە زۆرلەخۆکردن، وە دەست بگرن بەدینی یەکەمجار ەوە).

**١١٢** - وَاعْلَمْ أَنَّ الدِّينَ العَتِيقَ: مَا كَانَ مِن وَفَاةِ رَسُولِ اللَّه ﷺ إِلَى قَتْلِ عُثْمَانَ ابْنِ عَفَّانَ رضي اللَّهُ عنه، وَكَانَ قَتْلُهُ أَوَّلَ الفُرْقَةِ وَأَوَّلَ الْاخْتِلافِ، فَتَحَارَبَتِ الأُمَّةُ، وَتَفَرَّقَتْ وَاتَّبَعَتِ الطَّمَعَ وَالأَهْوَاءَ، وَالمَيْلَ إِلَى الدُّنْيَا، فَلَيْسَ لأَحَدٍ رُخْصَةٌ فِي شَيْءٍ أَحْدَثَهُ، مِمَّا لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَوْ يَكُونُ رَجُلٌ يَدْعُو إِلَى شَيْءٍ أَحْدَثَهُ مَنْ قَبْلَهُ مِنْ أَهْلِ البِدَعِ، فَهُوَ كَمَنْ أَحْدَثَهُ، فَمَن زَعَمَ ذَلِكَ أَوْ قَالَ بِهِ فَقَدْ رَدَّ السُّنَّةَ، وَخَالَفَ الحَقَّ وَالجَمَاعَةَ، وَأَبَاحَ البِدَعَ، وَهُوَ أَضَرُّ عَلَى هَذِهِ الْأُمَّةِ مِن إِبْلِيسَ.

وَمَن عَرَفَ مَا تَرَكَ أَصحَابُ البَدَعِ مِنَ السُّنَّةِ وَمَا فَارَقُوا فِيهِ فَتَمَسَّكَ بِهِ فَهُوَ صَاحِبُ سُنَّةٍ وَصَاحِبُ جَمَاعَةٍ، وَحَقِيقٌ أَنْ يُتَّبَعَ وَأَنْ يُعَانَ وَأَنْ يُحْفَظَ وَهُوَ مِمَّنْ أَوْصَى بِهِ رَسُولُ اللَّه ﷺ .

**١١٢** - وه بزانه دینی یەکەمجار : ئەو دینەیە پێغەمبەری الله ﷺ لەسەری وەفاتی کرد، تاکو کوشتنی عوسمانی کوڕی عەفان رضي الله عنه کوشتنی ئەو سەرەتای دووبەرەکی جیاوازی بوو، جا ئەم ئوممەتە جەنگیان بەرپاکرد، وە لەگەڵ یەکتردا جیاوازی بوون، وە شوێنی تەماح و هەوا و ئارەزوو کەوتن، لادان بەرەو لای دونیا، جا هیچ کەسێك مۆڵەتی پێ نەدراوە لە هەرشتێکدا دایهێنێ لەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ لەسەری نەبوون، یان بانگەواز بۆ داهێنراوێک بکات لەپێش خۆی دایهێنابێ لەبیدعەکاران، ئەوە وەکو ئەو کەسەیە خۆی دایهێنابێ، هەرکەسێک باوەڕی وابێت یان ئەوە بڵێت ئەوا سوننەتی ڕەتکردووەتەوە و پێچەوانەی حەق و جەماعەیە، وە بیدعەی حەڵاڵ کردووە، ئەو کەسەش زیانبەخشترە لەسەر ئەم ئومەتە لە ئیبلیس .

هەر کەسێک بزانێ کە بیدعەکاران وازیان لە چ سوننەتێک هێناوە و لە چ شتێکدا جیاواز بوون، وە دەستی پێوە بگرێ ئەوە ئەو کەسە خاوەنی سوننەت و جەماعەیە، حەقی خۆیەتی شوێنی بکەون، وە یارمەتی بدرێت، وە

بپارێزرێت، وە ئەویش لەو کەسانەیە کە پێغەمبەری الله ﷺ وەسیەتی پێ کردوون .

**١١٣** - وَاعْلَمُوا رَحِمَكُمُ اللَّه أَنَّ أُصُولَ البِدَعِ أَرْبَعَةُ أَبْوَابٍ : يَتَشَعَّبُ مِن هَذِهِ الْأَرْبَعَةِ اثْنَانِ وَسَبْعُونَ هَوَى، ثُمَّ يَصِيرُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ البِدَعِ يَتَشَعَّبُ حَتَّى تَصِيرَ كُلُّهَا إِلَى أَلْفَينِ وَثَمَانِمِائَةٍ مَقَالَة، وَكُلُّهَا ضَلالَةٌ، وَكُلُّهَا فِي النَّارِ إِلَّا وَاحِدَةٌ، وَهُوَ مَن آمَنَ بِمَا فِي هَذَا الْكِتَابِ، وَاعْتَقَدَهُ مِنْ غَيْرِ رِيبَةٍ فِي قَلْبِهِ وَلَا شُكُوكٍ، فَهُوَ صَاحِبُ سُنَّةٍ، وَهُوَ النَّاجِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ .

**١١٣** - وە بزانن ڕەحمەتی الله تان لێ بێت بناغەی بیدعەکان چوار بناغەیە : لەم چوارەوە حەفتا و دوو هەواو ئارەزووی لێ دەبێتەوە، ئینجا هەریەکێك لەوانە دەبێتە چەند لقێکەوە، تاکو هەر هەمووی دەگاتە دوو هەزارو هەشت سەد وتە، وە هەر هەمووی گومڕاییە، هەر هەمووی لە ئاگردان، تەنها یەکێکیان نەبێ، ئەویش ئەو کۆمەڵەن کە باوەڕیان هەیە بەوەی لەم کتێبەدا هەیە، وە بڕوایان پێی هەیە بەبێ هیچ گومانێک لە دڵیدا، ئەوە کەسێکی سوننیە، هەر ئەویش دەربازی دەبێ إن شاء الله .

**١١٤** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّه لَوْ أَنَّ النَّاسَ وَقَفُوا عِنْدَ مُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ وَلَمْ يَتَجَاوَزُوهَا بِشَيْءٍ وَلَمْ يُوَلِّدُوا كَلامًا مِمَّا لَمْ يَجِئْ فِيهِ أَثَرٌ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَلَا عَنْ أَصْحَابِهِ لَمْ تَكُنْ بِدْعَةٌ .

**١١٤** - وه بزانه ڕەحمەتی الله ت لێ بێت ئەگەر خەڵكی لەسەر شته داهێنراوەكان بوەستانایە، وە بەسەریدا تێنەپەڕینایە، هیچ قسەیەكیان دروست نەكردایە كە لەبارەیەوە ئەثەرێك لە پێغەمبەری الله وە ﷺ هاوەڵانەوە نەهاتبێت، ئەوا بیدعە دروست نەدەبوو .

**١١٥** - وَاعْلَمْ أَنَّهُ لَيْسَ بَيْنَ العَبْدِ وَبَيْنَ أَنْ يَكُونَ مُؤْمِنًا حَتَّى يَصِيرَ كَافِرًا؛ إِلَّا أَنْ يَجْحَدَ شَيْئًا مِمَّا أَنْزَلَهُ اللَّهُ تَبَارَكَ وتَعَالى، أَوْ يَزِيدَ فِي كَلامِ اللَّه، أَوْ يَنْقُصَ، أَوْ يُنْكِرَ شَيْئًا مِمَّا قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ، أَوْ شَيْئًا مِمَّا تَكَلَّمَ بِهِ رَسُولُ اللَّه ﷺ، فَاتَّقِ اللَّه رَحِمَكَ اللَّهُ وَانْظُرْ لِنَفْسِكَ وَإِيَّاكَ وَالغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ طَرِيقِ الحَقِّ فِي شَيْءٍ .

**١١٥** - وه بزانه ڕەحمەتی الله ت لێ بێت هیچ شتێک نییه له نێوان بەندە و ئەوەی پێی دەبێت بە ئیمادار تاکو دەبێت بە کافر ئیللا نکوڵی له شتێک بکات که الله تعالی دایبەزاندبێت، یان له قسەکانی الله تعالی زیادبکات، یان کەمی بکاتەوە، یان ئینکاری له شتێک بکات که الله وتبێتی، یان پێغەمبەری الله ﷺ وتبێتی .

جا له الله بترسه ڕەحمەتی الله ت لێ بێت خەمی خۆت بخۆ، وە ئاگاداری زیادەڕۆیی بە لە ديندا، چونكە ئەوە بەهیچ شێوەیەك ڕێگای حەق نییە .

**١١٦** - وَجَمِيعُ مَا وَصَفْتُ لَكَ فِي هَذَا الكِتَابِ فَهُوَ عَنِ اللَّه تَعَالَى وَعَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ، وَعَنِ أصحَابِهِ وَعَنِ التَّابِعِينَ وَعَنِ القَرْنِ الثَّالِثِ إِلَى القَرْنِ الرَّابِعِ .

فَاتَّقِ اللَّه يَا عَبْدَ اللَّه، وَعَلَيْكَ بِالتَّصْدِيقِ وَالتَّسْلِيمِ وَالتَّفْوِيضِ وَالرِّضَا لِمَا فِي هَذَا الكِتَابِ، وَلا تَكْتُمْ هَذَا الكِتَابَ أَحَدًا مِن أَهْلِ القِبْلَةِ فَعَسَى يَرُدُّ اللَّه بِهِ حَيْرَانًا عَنْ حَيْرَتِهِ، أَوْ صَاحِبَ بِدْعَةٍ عَنْ بِدْعَتِهِ، أَوْ ضَالًّا عَنْ ضَلَالَتِهِ فَيَنْجُو بِهِ، فَاتَّقِ اللَّه، وَعَلَيْكَ بِالأَمْرِ الأَوَّلِ العَتِيقِ، وَهُوَ مَا وَصَفْتُ لَكَ فِي هَذَا الْكِتَابِ، فَرَحِمَ اللَّهُ عَبْدًا، وَرَحِمَ وَالِدَيْهِ، قَرَأَ هَذَا الكِتَابَ، وَبَثَّهُ، وَعَمِلَ بِهِ، وَدَعَا إِلَيْهِ، وَاحْتَجَّ بِهِ، فَإِنَّهُ دِينُ اللَّه وَدِينُ رَسُولِ اللَّه ﷺ .

فَإِنَّهُ مَنِ اسْتَحَلَّ شَيْئًا خِلافَ مَا فِي هَذَا الكِتَابِ فَإِنَّهُ لَيْسَ يَدِينِ للهِ بِدِين، وَقَدْ رَدَّهُ كُلَّهُ؛ كَمَا لَوْ أَنَّ عَبْدًا آمَنَ بِجَمِيعِ مَا قَالَ اللَّه تَبَارَكَ وتَعَالى، إِلَّا أَنَّهُ شَكَّ فِي حَرْفٍ فَقَدْ رَدَّ جَمِيعَ مَا قَالَ اللَّهُ تَعالَى، وَهُوَ كَافِرٌ؛ كَمَا أَنَّ شَهَادَةَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ لا تُقْبَلُ مِن صَاحِبِهَا إِلَّا بِصِدْقِ النِّيَّةِ وَخالِصِ اليَقِينِ؛ كَذَلِكَ لَا يَقْبَلُ اللَّه شَيْئًا مِنَ السُّنَّةِ فِي تَرْكِ بَعْضٍ، وَمَن تَرَكَ مِنَ السُّنَّةِ شَيْئًا فَقَدْ تَرَكَ السُّنَّةَ كُلَّهَا .

فَعَلَيْكَ بِالقَبُولِ، وَدَعْ عَنْكَ المَحَكَ وَاللَّجَاجَةَ، فَإِنَّهُ لَيْسَ مِن دِينِ اللَّه فِي شَيْءٍ، وَزَمَانُكَ خَاصَّةً زَمَانُ سُوءٍ فَاتَّقِ اللَّه .

**١١٦** - هەموو ئەوەی لەم کتێبەدا وەصفم بۆت کردووە لە الله تعالی و لە پێغەمبەرەوەیە الله ﷺ، وە لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و لە سەدە سێیەم تا سەدەی چوارەم ـەوەیە .

لە الله بترسە ئەی بەندەی الله، ئەوەی پێویستە لەسەرت بەڕاست زانین و تەسلیم بوون و گەڕاندنەوە و ڕازی بوون بەوەی لەم کتێبەدا هەیە، ئەم کتێبە لە هیچ کەسێکی ئەهلی قیبلە مەشارەوە، بەڵکو سەرلێ شێواوێک لە سەرلێ شێواویەکەی بگەڕێتەوە، یان خاوەن بیدعەیەک لە بیدعەکەی، یان گومڕایەک لە گومڕاییەکەی و پێی دەرباز ببێت .

لە الله بترسە، پێویستە لەسەرت دەست بە دینەی یەکەمجارەوە بگریت [واتە ئەوەی هاوەڵان رضي الله عنهم و سەلەف لەسەری بوون] بگریت، ئەویش ئەوەیە لەم کتێبەدا وەصفم بۆت کردووە، ڕەحمەتی الله لەو بەندەیە، وە ڕەحمەتی الله لە دایک و باوکی ئەوەی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە، وە بڵاوی دەکاتەوە و کاری پێدەکات و بانگەوازی بۆ دەکات، وە بەڵگەی پێ دەهێنێتەوە، چونکە ئەوە دینی الله و دینی پێغەمبەری الله یە ﷺ .

هەر کەسێک شتێک حەڵاڵ بکات جیاواز بێت لەوەی لەم کتێبەدا هەیە، ئەوا بە دینی الله دینداری نەکردووە، هەمووی ڕەتکردووەتەوە، هەروەکو ئەوەی کەسێک باوەڕی بە هەموو ئەوەی الله تعالی فەرموویەتی هەیە تەنیا لە یەک پیتدا گومانی هەیە ئەوا هەموو ئەوەی الله تعالی

فەرموویەتی ڕەتیکردووەتەوە، ئەویش کافرە، هەروەکو چۆن شایەتیدانی لا إله إلا الله لە خاوەنەکەی وەرناگیرێ، ئیللا بە ڕاستگۆیی و نیەت و یەقینێکی دڵسۆزەوە نەبێت، بەهەمان شێوە الله تعالى هیچ لە سوننەت وەرناگرێ بە وازهێنان لە هەندێکی، هەرکەسێ وازی لە بەشێکی سوننەت هێنا، ئەوا وازی لە هەموو سوننەت هێناوە، لەسەرتە قبوڵی بکەیت، واز لە وتە وت و یاخیبوون بێنیت، چونکە ئەوە بەهیچ شێوەیەک لە دینی الله دا نییە، بەتایبەتی سەردەمەکەی تۆ، سەردەمێکی خراپە بۆیە لە الله بترسە .

١١٧ - وَإِذَا وَقَعَتِ الفِتْنَةُ فَالْزَمْ جَوْفَ بَيْتِكَ، وَفِرَّ مِن جِوَارِ الْفِتْنَةِ، وَإِيَّاكَ وَالعَصَبِيَّةَ، وَكُلُّ مَا كَانَ مِن قِتَالٍ بَيْنَ المُسْلِمِينَ عَلَى الدُّنْيَا فَهُوَ فِتْنَةٌ فَاتَّقِ اللَّه وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَلَا تَخْرُجْ فَيهَا وَلا تُقَاتِلْ فِيهَا، وَلَا تَهْوَى وَلَا تُشَايع وَلَا تُمَايل، وَلَا تُحِبَّ شَيْئًا مِن أُمُورِهِمْ، فَإِنَّهُ يُقَالُ : مَنْ أَحَبَّ فِعَالَ قَوْمٍ خَيْرًا كَانَ أَوْ شَرًّا كَانَ كَمَنْ عَمِلَهُ، وَفَقَنَا اللَّهُ وَإِيَّاكُم لِمَرْضَاتِهِ، وَجَنَّبَنَا وَإِيَّاكُمْ مَعَاصِيَهُ .

١١٧ - ئەگەر فیتنە ڕوویدا ئەوا پەیوەستبە بە ماڵەکەی خۆتەوە، لە ناوچەی فیتنە دوور بکەوە، وە ئاگادار و وریای دەمارگیری بە، هەر کوشتارێک لە نێوان موسڵماناندا لەسەر دونیا ڕوویداوە ئەوا فیتنەیە، بۆیە لە خوایە بترسە کە تاک و تەنهایە هیچ هاوبەشێکی نییە، وە تێیدا دەرمەچۆ و کوشتاریش مەکە، ئارەزووت بۆ کەس نەڕوات و لەگەڵ

هیچ پارچەیەکدا مەبەو لامەدە، هیچ شتێک لە کاروباری ئەوانت لا خۆشەویست نەبێ، چونکە گوتراوە : هەرکەسێك کردەوەی کۆمەڵێکی خۆش بوێت جا ئەگەر چاك بوو یان خراپ بوو ئەوا وەکو ئەو کەسەیە کاری پێ کردبێت، اللّٰه تعالی ئێمە و ئێوەش تەوفیق بدات بۆ ڕەزامەندی خۆی دوورمان بخاتەوە لەسەرپێچی کردنی .

**١١٨ -** وَأَقِلَّ مِنَ النَّظَرِ فِي النُّجُومِ، إِلَّا مَا تَسْتَعِيْنُ بِهِ عَلَى مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ، وَالْهَ عَمَّا سِوَى ذَلِكَ، فَإِنَّهُ يَدْعُو إِلَى الزَّنْدَقَةِ .

**١١٨ -** بە کەمی تەماشای ئەستێرەکان بکە، ئیللا ئەوە نەبێ پشتی پێ ببەستی بۆ زانینی نوێژەکان، جگە لەوە وازی لێ بهێنە چونکە ئەوە بەرەو زەندیقی دەتبات .

---

**: مەبەستی لەو جۆرە کوفرەیە کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن و بورج ناسی، بەپێی بورجەکان دەڵێن فلانە و فلانە شت ڕوودەدات، ئەوەش زەندەقەیە چونکە هیچ کەس غەیب نازانێت تەنها اللّٰه تعالی نەبێت، وە ئەستێرەکان هیچ پەیوەندیان بە قەدەرەوە نییە، ئەوە تەنها فیکرەیەکی شەیتانیە .**

**١١٩** - وَإِيَّاكَ وَالنَّظَرَ فِي الكَلامِ، وَالجُلُوسَ إِلَى أَصْحَابِ الكَلامِ، وعَلَيْكَ بِالْآثَارِ وَأَهْلِ الْآثَارِ، وَإِيَّاهُمْ فَاسْأَلْ، وَمَعَهُمْ فَاجْلِسْ، وَمِنْهُمْ فَاقْتَبِسْ .

**١١٩** - وریابە و دوور بكەوە لە تەماشاكردنی كەلام، وە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی كەلام، وە دەست بگرە بە فەرموودە و ئەهلی فەرموودە، وە پرسیار لەوان بكە، وە لەگەڵ ئەواندا دانیشە، وە لەوانەوە وەرگرە .

---

**: بۆ زیاتر ئاشنابوون بە هاوەڵانی جەهلی كەلام و ڕسواكردنیان لەلایەن سەلەفەوە خوێنەری ئەم نامیلكەیە بن :**

**https://t.me/Ktebxanay_salaf1/444**

**١٢٠** - وَاعْلَمْ أَنَّهُ مَا عُبِدَ اللَّهُ بِمِثْلَ الخَوْفِ مِنَ اللَّه سُبْحَانَهُ، وَطَرِيقِ الخَوْفِ وَالحُزْنِ وَالشَّفَقَاتِ وَالحَيَاءِ مِنَ اللَّه تَبَارَكَ وَتَعَالَى .

**١٢٠** - وە بزانە الله تعالی نەپەرستراوە ب ەشتێك وەكو ترس لە الله سبحانە، وە ڕێگای ترس و خەم و بەزەیی و شەرم لە الله تبارک وتعالی .

**١٢١** - وَاحْذَرْ أَنْ تَجْلِسَ مَعَ مَن يَدْعُو إِلَى الشَّوْقِ وَالمَحَبَّةِ، وَمَن يَخْلُو مَعَ النِّسَاءِ وَطَرِيقِ المَذْهَبِ، فَإِنَّ هَؤُلَاءِ كُلَّهُمْ فِي الضَّلَالَةِ .

**١٢١** - وه ئاگاداربه لەوەی دابنیشی لەگەڵ ئەوانەی بانگەشەی تامەزرۆیی و خۆشەویستی دەکەن **[مەبەستی بە صۆفییەکانە کە شت دادەهێنن لە دیندا وواز لە سوننەت دێنن و دەڵێن ئێمە عاشقی الله و پێغەمبەرین!]**، وه ئەوانەی لەگەڵ ئافرەتاندا تێکەڵ دەبن و لەسەر تەریقەتن، چونکە هەموو ئەوانەی لەسەر گومڕایین .

**١٢٢** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّه أَنَّ اللَّه تَعَالَى دَعَا الخَلْقَ كُلَّهُمْ إِلَى عِبَادَتِهِ، وَمَنَّ مِن بَعْدِ ذَلِكَ عَلَى مَن يَشَاءُ بِالإِسْلامِ تَفَضَّلًا مِنْهُ .

**١٢٢** - وه بزانە ڕەحمەتی الله ت لێ بێت الله تعالی بانگی هەموو خەڵکی کردووه بۆ پەرستنی خۆی بە تەنها، وه لەپاش ئەوه منەتی خۆی ڕژاندووه بەسەر ئەو کەسەی ویستی لێ بێت بە ئیسلام بە فەزڵ و منەتی خۆی .

**١٢٣** - وَالكَفُّ عَن حَرْبِ عَلِيٍّ وَمُعَاوِيَةَ وَعَائِشَةَ وَطَلْحَةَ وَالزُّبَيْرِ رَحِمَهُمُ اللَّه أَجْمَعِينَ وَمَن كَانَ مَعَهُم وَلَا تُخَاصِمْ فِيهِم وَكِلْ أَمْرَهُمْ إِلَى اللَّه تَبَارَكَ وَتَعَالَى، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ : (إِيَّاكُم وَذِكْرَ أَصْحَابِي وَأَصْهَارِي وَأَخْتَانِي) .

وَقَوْلُهُ : (إِنَّ اللَّه تَبَارَكَ وَتَعَالَى نَظَرَ إِلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ : اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَكُم) .

**١٢٣** - وه وازهێنان له باس كردنی ئه‌و جه‌نگه‌ی ڕوویدا له نێوان علي و مه‌عاوية و عائيشة و طلحة و زوبير ڕه‌حمه‌تی الله له هه‌موویان بێت و له هه‌موو ئه‌وانه‌ی كه له‌گه‌ڵیاندا بوون، وه مشتومڕ مه‌كه ده‌رباره‌یان، كارو باسه‌كه‌یان بگه‌ڕێنه‌وه بۆ لای الله تبارك تعالى، چونكه پێغه‌مبه‌ری الله ﷺ فه‌رموویه‌تی : (ئاگادار بن له‌وه‌ی باسی هاوه‌ڵان و خه‌زوران و زاواكانم بكه‌ن به خراپه) .

وه فه‌رموویه‌تی : (الله تبارك وتعالى سه‌يری ئه‌هلی به‌دری كرد فه‌رمووی : هه‌رچی ده‌تانه‌وێت بیكه‌ن ئه‌وا بیكه‌ن من لێتان خۆشبوومه) .

**١٢٤** - وَاعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّه أَنَّهُ لَا يَحِلُّ مَالُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِطِيبَةٍ مِنْ نَفْسِهِ، وَإِنْ كَانَ مَعَ رَجُلٍ مَالٌ حَرَامٌ فَقَدْ ضَمِنَهُ، لَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِهِ، فَإِنَّهُ عَسَى أَنْ يَتُوبَ هَذَا فَيُرِيدُ أَنْ يَرُدَّهُ عَلَى أَرْبَابِهِ، فَأَخَذْتَ حَرَامًا .

**١٢٤** - وه بزانه ڕه‌حمه‌تی الله ت لێ بێت ماڵی هیچ موسڵمانێك حه‌ڵاڵ نییه، ئیللا به ڕازیبوونی خۆی نه‌بێ، ئه‌گه‌ر پاره‌یه‌كی حه‌رام لای كه‌سێك بوو ئه‌وا پاره‌كه هه‌ر لای خۆی ده‌بێت، بۆ هیچ كه‌سێك حه‌ڵاڵ نییه هیچ شتێكی لێ ببات ئیللا به ئیزنی ئه‌و نه‌بێ، چونكه ڕه‌نگه ئه‌و ته‌وبه بكات و بیه‌وێ ماڵه‌كه‌ی بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی بگه‌ڕێنێته‌وه، ئه‌و كاته تۆ حه‌رامێكت بردووه .

**١٢٥** - وَالمكَاسِبُ مُطْلَقَة مَا بَانَ لَكَ صِحْتُهُ فَهُوَ مُطْلَقٌ، إلَّا مَا ظَهَرَ فَسَادُهُ، وَإِنْ كَانَ فَاسِدًا يَأْخُذُ مِنَ الفَاسِدِ مَمْسَكَةً نَفْسِهِ، وَلا تَقُولُ : أَتْرُكُ المكَاسِبَ وَآخُذُ مَا أَعْطَوْنِي، لَمْ يَفْعَلْ هَذَا الصَّحَابَةُ وَلا العُلَمَاءُ إِلَى زَمَانِنَا هَذَا .

وَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ رضِي اللهُ عَنْهُ : (كَسْبٌ فِيهِ بَعْضُ الدَّنِيَّةِ خَيْرٌ مِنَ الحَاجَةِ إِلَى النَّاسِ) .

**١٢٥** - وه هەموو كەسابەتەكان ئەوەی بۆت ڕوون بووەتەوە لە دروستیەتی ئەوە **[لە حوكمی]** ڕەهاییدایە **[واتە بە گشتی كەسابەتەكان حەڵاڵن، وە هەر كاسپیەك بۆت دەركەوت حەڵاڵە ئەوە لەو گشتیەیە و حەڵاڵە]**، ئیللا ئەوە نەبێ خراپیەكەی دەركەوتووە، ئەگەر خراپ بوو ئەوەندە لە خراپەكە دەبات تەنها بۆ مانەوەی نەفسی خۆی، مەڵێ : واز لەكەسابەت دەهێنم ئەوە دەبەم كە پێمی دەدەن **[واتە چاوت لەدەستی خەڵك بێت كە شتێكت پێ بدەن]**، ئەمە هاوەڵان نەیانكردووە، وە زانایان تاكو ئەم سەردەمە نەیانكردووە .

عومەری كوڕی خطاب رضي الله عنه فەرموویەتی : (كەسابەتێك كە پارەی كەمی تێدا بێت چاكترە لە پێویستبوون بە دەستی خەڵكی) .

**١٢٦** - وَالصَّلَوَاتُ الخَمْسُ جَائِزَةٌ خَلْفَ مَن صَلَّيْتَ خَلْفَهُ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ جَهْمِيًّا، فَإِنَّهُ مُعَطِّلٌ، وَإِنْ صَلَّيْتَ خَلْفَهُ فَأَعِدْ صَلَاتَكَ، وَإِنْ كَانَ إِمَامُكَ يَوْمَ

الجُمُعَةِ جَهْمِيًّا وَهُوَ سُلْطَانٌ فَصَلِّ خَلْفَهُ، وَأَعِدْ صَلاتَكَ، وَإِنْ كَانَ إِمَامُكَ مِنَ السُّلْطَانِ وَغَيْرِهِ صَاحِبَ سُنَّةٍ فَصَلِّ خَلْفَهُ وَلَا تُعِدْ صَلَاتَكَ .

**١٢٦** - وه پێنج نوێژەکه دروسته له پشتی هەر کەسێکەوه بیکەیت ئیللا جەهمی نەبێت چونکه ئەوه پەکخەره [**معطلة : واته ناوو سیفاتەکانی الله تعالى جێگیر ناکەن]**، جا ئەگەر نوێژت لەپشتییەوه کرد ئەوا نوێژەکەت دووباره بکەرەوه، ئەگەر پێشنوێژەکەت جەهمی بوو له کاتێکدا ئەو دەسەڵاتدار بوو ئەوا نوێژ له پشتیەوه بکە، وه نوێژەکەت دووباره بکەرەوه، ئەگەر پێشنوێژەکەت دەسەڵاتداربوو یان جگه لەو خاوەنی سوننه بوو ئەوا نوێژ لەپشتییەوه بکە، وه نوێژەکەت دووباره مەکەرەوه .

---

**: بۆ زیاتر ئاشنابوون به بابەتی نوێژکردن له پشتی کەسێکی کافرەوه خوێنەری ئەم نامیلکەیه بن :**

**https://t.me/Ktebxanay_salaf1/102**

**١٢٧** - وَالإِيمَانُ بِأَنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رَحْمَةُ اللَّه عَلَيْهِمَا فِي حُجْرَةِ عَائِشَةَ رضي اللَّه عنها مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَدْ دُفِنَا هُنَالِكَ مَعَهُ، فَإِذَا أَتَيْتَ القَبْرَ فَالتَّسْلِيمُ عَلَيْهِما وَاجِبٌ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ .

**١٢٧** - وه باوه‌ڕه‌بوون به‌وه‌ی ئه‌بوبه‌كر و عومه‌ر ڕه‌حمه‌تی الله یان لێبێت له ژووره‌كه‌ی عائشة رضي الله عنها له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری الله ﷺ له‌وێ نێژراون، جا ئه‌گه‌ر چوویت بۆ لای گۆڕه‌كه ئه‌وه سه‌لام كردن له هه‌ردووكیان له پاش پێغه‌مبه‌ری الله ﷺ واجبه .

**١٢٨** - وَالأَمْرُ بِالْمُعْرُوفِ، وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ وَاجِبٌ إِلَّا مَن خِفْتَ سَيْفَهُ أَوْ عَصَاهُ .

**١٢٨** - وه فه‌رمان كردن به چاكه و نه‌هی كردن له خراپه واجبه ئیللا به‌رامبه‌ر ئه‌و كه‌سه نه‌بێت كه له شمشێر یان له داره‌كه‌ی بترسیت .

**١٢٩** - وَالتَّسْلِيمُ عَلَى عِبَادِ اللَّه أَجْمَعِينَ .

**١٢٩** - وه سه‌لام كردن له هه‌مووی به‌نده‌كانی الله .

**١٣٠** - وَمَن تَرَكَ صَلاةَ الجُمُعَةِ وَالجَمَاعَةِ فِي المَسْجِدِ مِن غَيْرِ عُذْرٍ فَهُوَ مُبْتَدِعُ، وَالعُذْرُ : كَمَرَضٍ لا طَاقَةَ لَهُ بِالخُرُوجِ إِلَى الْمَسْجِدِ، أَوْ خَوْفٍ مِن سُلْطَانٍ ظَالِمٍ، وَمَا سِوَى ذَلِكَ فَلَا عُذْرَ لَه، وَمَن صَلَّى خَلْفَ إِمَامٍ فَلَمْ يَقْتَدِ بِهِ فَلَا صَلَاةَ لَهُ .

**١٣٠** - هەر کەسێک واز لە نوێژی جومعە و جەماعەت بهێنێ لە مزگەوت بەبێ هیچ بیانوویەک ئەوە بیدعەچییە، بیانووش ئەوەیە : وەک نەخۆشیەک کە نەتوانێ دەرچێت بۆ مزگەوت، یان ترسان لە دەسەڵاتدارێکی ستەمکار، جگە لەوانە ئەوا هیچ بیانویەکی نییە، وە هەر کەسێک لە پشت پێشنوێژێکەوە نوێژی کرد و ئیقتدای پێوە نەکرد ئەوا نوێژەکەی دروست نییە .

**١٣١** - وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ بِاليَدِ وَاللَّسَانِ وَالقَلْبِ بِلا سَيفٍ.

**١٣١** - وە فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە بە دەست و زمان و دڵ نەك بە شمشێر .

**١٣٢** - وَالمَسْتُورُ مِنَ المُسْلِمِينَ مَن لم يَظْهَرُ مِنْهُ رِيبَةٌ .

**١٣٢** - کەسی داپۆشراو لە موسڵمانان ئەو کەسەیە کە هیچ شتێکی گوماناوی لێ دەرنەکەوتووە .

**١٣٣** - وَكُلُّ عِلْمِ ادَّعَاهُ العِبَادُ مِن عِلْمِ البَاطِنِ لَمْ يُوجَدْ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، فَهُوَ بِدْعَةٌ وَضَلَالَةٌ، وَلَا يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَن يَعْمَلَ بِهِ، وَلَا يَدْعُوَ إِلَيْهِ .

**١٣٣** - هەر علمێک بەندەکان بانگەشەی بۆ دەکەن لە عیلمی شاراوە لە کیتاب و سوننەتدا نەبێ ئەوە بیدعەیە و گومڕاییە، وە بۆ هیچ کەسێک نابێ کاری پێ بکات و بانگەوازی بۆ بکات .

**١٣٤** - وَأَيُّمَا امْرَأَةٍ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِرَجُلٍ فَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لَهُ، يُعَاقَبَانِ إِن نَالَ مِنْهَا شَيْئًا، إِلَّا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْ عَدْلٍ وَصَدَاقٍ .

**١٣٤** - وە هەر ئافرەتێک خۆی پێشکەش بە پیاوێک کرد ئەوا بۆی حەڵاڵ نییە، هەردووکیان سزا دەدرێن ئەگەر هەر کارێك بکەن، ئیللا بەبوونی خاوەنەکەی [وەلی امر] و دوو شایەتی دادپەروەر و مارەیی نەبێ .

**١٣٥** - وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَطْعَنُ عَلَى أَحَدٍ مِن أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ - فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ قَوْلِ سُوءٍ وهَوَى؛ لِقَوْلِ رَسُولِ : (إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا) .

فَقَدْ عَلِمَ النَّبِيُّ ﷺ مَا يَكُونُ مِنْهُمْ مِنَ الزَّلَلِ بَعْدَ مَوْتِهِ، فَلَمْ يَقُلْ فِيهِمْ إِلَّا خَيْرًا، وَقَوْلُهُ : (ذَرُوا أَصْحَابِي، لَا تَقُولُوا فِيهِم إِلَّا خَيْرًا) .

وَلَا تُحَدِّثْ بِشَيْءٍ مِن زَلَلِهِمْ، وَلا حَرْبِهِمْ، وَلا مَا غَابَ عَنْكَ عِلْمُهُ، وَلَا تَسْمَعْهُ مِن أَحَدٍ يُحَدِّثُ بِهِ، فَإِنَّهُ لَا يَسْلَمُ لَكَ قَلْبُكَ إِنْ سَمِعْتَ .

١٣٥ - وە ئەگەر کەسێکت بینی تانەی لە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ دەدا ئەوا بزانە کە خاوەنی قسەی خراپ و هەوا و ئارەزووە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری الله ﷺ کە دەفەرمووێت : (ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا ئەوا دەست هەڵگرن) .

چونکە پێغەمبەری الله ﷺ دەیزانی لە پاش مردنی ئەو تووشی هەڵەدەبن، بۆیە لە چاکە زیاتر دەربارەیان هیچی نەگوتوە، وە دەفەرمووێت : (واز لە هاوەڵانم بێنن، دەربارەیان هیچ قسەیەک مەکەن جگە لە خێر و چاکە نەبێت) .

دەربارەی هەڵەکان هیچ مەگێڕەوە، وە دەربارەی جەنگەکانیان و ئەوەی کە پێی نازانیت و نادیارە لات، گوێ لە هیچ کەسێک مەگرە باسی دەکات، چونکە دڵت هەرگیز سەلامەت نابێ ئەگەر تۆ ئەوەت بیست .

---

ئیمام حرب الكرماني لە **کتاب السنة** دا ئەڵێت :

**٨١ - بۆ هیچ کەسێک درووست نییە هیچ شتێک لە خراپیەکانیان باس بکات - واتە ئەو کێشە و ناکۆکیانەی نێوان هاوەڵان هەیە نابێت باس بکرێت - ، وە نابێت**

تانه له هیچ یەکێک لەوان بدات به عەیبێک، وه نه بەکەموکوڕیەک، وه نه به لەکەدارکردنێک .

هەر کەسێک ئەو کاره بکات، ئەوا واجبه لەسەر فەرمانڕەوا : تەمبێ بکات و سزای بدات، بۆی نییه لێی خۆشبێت، بەڵکو سزای دەدات پاشان داوای تەوبەی لێدەکات، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا لێی قبوڵ دەکرێت، ئەگەر تەوبەی نەکرد، ئەوا دووباره سزا دەدرێتەوه، پاشان بەند دەکرێت بۆ هەمیشه تاوەکو تەوبه دەکات و دەگەڕێتەوه .

ئەوەیه سوننەت بەرامبەرهاوەڵانی رسول الله ﷺ .

**١٣٦** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَطْعَنُ عَلَى الْآثَارِ أَوْ يَرُدُّ الْآثَارَ أَوْ يُرِيدُ غَيْرَ الْآثَارِ فَاتَّهِمْهُ عَلَى الإِسْلامِ، وَلَا تَشُكَّ أَنَّهُ صَاحِبُ هَوَى مُبْتَدِعُ .

**١٣٦** - وه ئەگەر کەسێکت بینی تانه له ئەثەر دەدات یان ئەثەر ڕەتدەکاتەوه، یان جگه له ئەثەری دەوێت، ئەوا تۆمەتباری بکه لەسەر ئیسلام، گومانت نەبێ ئەوه خاوەنی هەوا و ئارەزووه بیدعەچیه .

---

: لەبەرئەوەی ئاثارەکانی سەلەف رحمهم الله ڕوونکەرەوەی قورئان و فەرموودەن .

أيوب السختياني وتی :

پیاوێک به مطرف ی وت : ئێوه شتێکی باشترتان ئەوێت له قورئان؟

وتی : (نەخێر، بەڵکو کەسێکمان ئەوێت شارەزاتر بێت لە ئێمە بە قورئان).

**كتاب العلم لـ أبي خيثمة : ٩٧**

: مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ تێگەیشتنی هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون هەتا بە شێوەیەکی ڕاست لە قورئان و فەرموودە تێبگەن. چونکە باشترین تێگەیشتن بۆ ئیسلام بریتیە لە تێگەیشتنی سەلەف رحمهم الله تعالی، هەموومان ئەزانین هاوەڵان رضي الله عنهم قورئانیان خوێندوووەتەوە، وە لێی تێگەیشتوون، ئایا تێگەیشتنی ئەوان بۆ قورئان و فەرموودە زیاترە؟ یان ئەوانەی پاش ئەوان؟ بێگومان تێگەیشتنی هاوەڵان زیاتر و باشترە لەبەر ئەوەی ئامادەی هاتنەخوارەوەی وەحی بوون، وە لەگەڵ رسول الله ﷺ دا بوون و زانیویانە لە چ حاڵەتێک و لەبەر چی هۆکارێک چ شتێکی فەرمووە.

**١٣٧** - وَاعْلَمْ أَنَّ جَوْرَ السُّلْطَانِ لا يُنْقِصُ فَرِيضَةً مِن فَرَائِضِ اللَّهِ الَّتِي افْتَرَضَهَا عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ، جَوْرُهُ عَلَى نَفْسِهِ، وَتَطَوُّعُكَ وَبِرُّكَ مَعَهُ تَامٌّ لك إِنْ شَاءَ اللَّه تَعَالَى، يَعْنِي : الجَمَاعَةَ وَالجُمُعَةَ مَعَهُم، وَالجِهَادَ مَعَهُم، وَكُلَّ شَيْءٍ مِنَ الطَّاعَاتِ فَشَارِكْهُمْ فِيهِ فَلَكَ نِيَّتُكَ.

**١٣٧** - وە بزانە ستەمی سوڵتان هەرگیز فەرزێک لە فەرزەکانی الله کەم ناکاتەوە کە لە سەر زاری پێغەمەرەکەی ﷺ فەرزی کردووە، ستەم کردنەکەی بۆ نەفسی خۆیەتی، وە چاکەی تۆ لەگەڵ ئەودا تەواوە إن شاء الله تعالی، واتە جەماعەت و جومعە و جیهادکردن لەگەڵ ئەودا، هەموو

شتێک لە گوێڕایەڵییەکان بەشدارییان لەگەڵدا بکە و ئەوا بەپێی نیەتەکەت بۆت دەنوسرێت .

---

**: هەموو ئەم ئەثەرانەی لە کتێبەکانی سەلەفدا هاتوون دەربارەی دەسەڵاتدارێکی موسوڵمانی چاکەکار یان خراپەکارە، نەوەک عەلمانیەک کە چەندین هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامی هەبێت .**

**١٣٨** - وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَدْعُو عَلَى السُّلْطَانِ فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ هَوَى، وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَدْعُو لِلسُّلْطَانِ بِالصَّلاحِ فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ سُنَّةٍ إِنْ شَاءَ اللَّه ؛ لِقَوْلِ الفُضَيْلِ بْنِ عِيَاضٍ: لَوْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ مَا جَعَلْتُهَا إِلَّا فِي السُّلْطَانِ .

أَنَا أَحْمَدَ بْنَ كَامِلٍ، قَالَ: نَا الْحُسَيْنِ بْنِ مُحَمَّدِ الطَّبَرِي، قَالَ : أَنَا مَرْدَوَيْهِ الصَّائِغُ، قَالَ : سَمِعْتُ فُضَيْلاً يَقُول : لَوْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ مَا جَعَلْتُهَا إِلَّا فِي السُّلْطَانِ .

قِيلَ لَهُ: يَا أَبَا عَلِيَّ، فَسِّرْ لَنَا هَذَا .

قَالَ : إِذَا جَعَلْتُهَا فِي نَفْسِي لَمْ تَعْدُنِي، وَإِذَا جَعَلْتُهَا فِي السُّلْطَانِ صَلَحَ، فَصَلَحَ بِصَلَاحِهِ العِبَادُ وَالبِلادُ .

فَأُمِرْنَا أَن نَدْعُوَ لَهُم بِالصَّلاحِ، وَلَمْ نُؤْمَرُ أَنْ نَدْعُوَ عَلَيْهِم وَإِنْ جَارُوا وَظَلَمُوا؛ لأَنَّ ظُلْمَهُمْ وَجَوْرَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَصَلَاحَهُم لأَنْفُسِهِمْ وَلِلْمُسْلِمِينَ .

**١٣٨** - وە ئەگەر کەسێکت بینی دوعای لەسوڵتان دەکرد بزانە ئەوە خاوەن ئارەزووە، بەڵام ئەگەر کەسێکت بینی دوعای بۆ سوڵتان دەکات بە چاکسازی و باشبوون ئەوا بزانە خاوەنی سوننەتە ان شاء الله .

لەبەر وتەی فضیل ی کوڕی عیاض کە ووتویەتی : ئەگەر تەنها یەک دوعام وەرگیرا بوایە ئەوە بۆ هیچ نەمدەکرد تەنها بۆ سوڵتان نەبێ .

أحمد ی کوڕی کامل بۆ گێڕاینەوە وتی : لە الحسین ی کوڕی محمد الطبري، لە عبدالصمد ی کوڕی زید ئەڵێت : گوێم لە فضیل بوو دەیفەرموو : ئەگەر وەڵامی دوعایەکم بدرێتەوە ئەوا دوعام نەدەکرد ئیللا بۆ سوڵتان نەبێت .

پێیان فەرموو : ئەی باوکی علي ئەمە ڕوون بکەرەوە، فەرمووی : ئەگەر دوعاکەم بۆ خۆم کرد ئەوە لە خۆم تێناپەڕێ، بەڵام ئەگەر بۆ سوڵتانم کرد ئەوا ئەو چاک دەبێ، بە چاک بوونی ئەو بەندەکان و وڵات چاك دەبێت .

جا فەرمانمان پێکراوە دوعای باشبوون و چاکسازییان بۆ بکەین، فەرمانمان پێ نەکراوە دوعایان لێ بکەین، ئەگەر ستەم و تاوانیان کرد، چونکە ستەم و تاوان لەسەر خۆیانە، چاک بوونیان بۆ خۆیان و موسڵمانانە.

**١٣٩** - وَلَا تَذْكُرْ أَحَدًا مِن أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُنَّ إِلَّا بِخَيْرٍ.

**١٣٩** - وه باسی هیچ یەكێك لەدایكانی ئیماندران مەكە ئیللا بەخێر و چاكە نەبێ .

**١٤٠** - وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَتَعَاهَدُ الفَرَائِضَ فِي جَمَاعَةٍ مَعَ السُّلْطَانِ وَغَيْرِهِ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ سُنَّةٍ إِن شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى، وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَتَهَاوَنُ بِالفَرَائِضِ فِي جَمَاعَةٍ وَإِنْ كَانَ مَعَ السُّلْطَانِ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ هَوَى .

**١٤٠** - وه ئەگەر كەسێكت بینی بەردەوامە لەسەر فەڕزەكان بەجامەعەت لەگەڵ سوڵتان وجگە لەو، بزانە ئەوە خاوەنی سوننەتە ان شاء الله تعالى، ئەگەر پیاوێكت بینی كەمتەرخەمە لە جێبەجێ كردنی فەڕزەكان بە جامەعەت هەرچەندە لەگەڵ سوڵتانیش بێت بزانە ئەوە خاوەنی هەوا و ئارەزووە .

---

: لە كتێبەكانی سەلەفدا زۆرباسی گوێڕایەڵبوون لە چاكە و دەرنەچوون لە سوڵتان و خەلیفەی موسوڵمانی خراپەكاردەكرێت، ئەمە لەبەرخۆشەویستی نییە بۆ سوڵتان، بەڵكو لەبەر ئەوەیە ئەگەر لەسەر سوڵتانەكە دەربچن ئەوە خوێنی ناحەق زۆر دەڕژێت و باری دەوڵەتی ئیسلامی زیاترتێكدەچێت ولەولاوە ئەگەرهەیە دوژمنەكانی وەكو فارس وڕۆم هێرش بكەنەسەر دەوڵەتی موسوڵمانان، یان لەوانەیە خەواریجەكان دەرفەتەكە بقۆزنەوە و

**ئەوانیش دەسەڵات بگرنەدەست، لەبەرئەوە دوعا دەکرێت بۆ سوڵتان بە باش بوون، لەبەر ئەوەی ئەگەرسوڵتان باش بێت ئەوە خەڵکیش باش ئەبن .**

**١٤١** - وَالحَلَالُ : مَا شَهِدْتَ عَلَيْهِ وَحَلَفْتَ عَلَيْهِ أَنَّهُ حَلَالٌ، وَكَذَلِكَ الحَرَامُ، وَمَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ : فَهُوَ شُبْهَةٌ .

**١٤١** - وە حەڵاڵ ئەوەیە شایەتی لەسەر بدەیت و سوێندی لەسەر بخۆی کە ئەوە حەڵاڵە، هەروەها حەرامیش بەو شێوەیەیە، وە ئەگەر دڵت بە شتێک توند بوو ئەوە جێی گومانە .

---

**: مەبەست پێی ئەوەیە کە حەڵاڵ هەیە و گومانی تێدا نییە لە حەڵاڵبوونی، وە حەرامیش هەیە کە گومان نییە لە حەرامبوونی، بەڵام ئەوەی کە گومانی هەیە و هەموو کەس نازانێ، پێویستە لەسەری لێی بکۆڵێتەوە تاکو بزانێت لە کامە بەشە .**

**١٤٢** - وَالمَسْتَورُ مَن بَانَ سَتْرُهُ، وَالمَهْتُوكُ مَن بَانَ هَتْكُهُ .

**١٤٢** - وە کەسی داپۆشراو ئەو کەسەیە کە داپۆشینەکەی ئاشکرایە، وە کەسی دەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە ریسوایەکەی ئاشکرایە .

---

: مستور حال مەبەست لە کەسێکە کە نوێژو موسوڵمانێتی لێ دەبینیت و هیچ شتێکی گوماناوی نەکردووە یان نەوتووە تا بە تەواوی حاڵیت بۆ دەربکەوێت بزانیت ئەهلی سوننەیە یان نا، واتە هیچی لێ دەرنەکەوتووە، داپۆشراوە .

وە مجهول حال یش هەیە کەسێکە کە هیچ شتێک لە ئیسلامەتی وە نە لە کوفرت لێ نەدیوە .

**١٤٣** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَقُولُ: فُلانٌ مُشَبِّهٌ، أَوْ فُلانٌ يَتَكَلَّمُ بالتَّشْبِيهِ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ جَهْمِيٌّ .

**١٤٣** - وە ئەگەر گوێت لە پیاوێک بوو دەیووت : فلانە کەس مشبهە یە، وە فلانە کەس قسەی دەبارەی تەشبیهـ دەکات، تۆمەتباری بکە و بزانە ئەوە جەهمی یە .

: جەهمیەکان هەر لە سەردەمی سەلەفەوە هەتا ئێستا بە ئەهلی سوننە و جەماعە و عەقیدەی سەلەف تۆمەتبار ئەکەن بە تەشبیهـ و تەجسیم، لەکاتێکدا سەلەف رحمهم الله تەنها ئایەت و فەرموودەکان وەکو خۆیان وەرئەگرن و لەسەر ڕووکەش جێگیری ئەکەن و ماناکەی ناگۆڕن و بە تەوحیدی ئەزانن نەک کوفر، بەڵام جەهمیەکان هەتا ئێستاش ڕووکەشی قورئان و سوننەت بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم ئەزانن و هەموو کوفرێک تاقی ئەکەنەوە تا کافربن بە قورئان و فەرموودە .

أبو حاتم و أبوزرعة ی الرازي رحمهم الله له عه‌قیده‌ی **(الرازين : ٤١)** ئه‌ڵێن : (نیشانه‌ی جه‌همیه‌كان ئه‌وه‌یه به ئه‌هلی سوننه ده‌ڵێن موشه‌بیهه) .

حرب الكرماني رحمه الله له **كتاب السنة** دا ئه‌ڵێت :

**١١٥** - (وه هه‌روه‌ها الجَهميَّة : ئه‌هلی سوننه ناو ده‌نێن : مشبّهة، وه جه‌همییه‌كان درۆیان كرد دوژمنانی الله تعالى، وه خۆیان له‌پێشترن به چواندن وبه‌درۆخستنه‌وه، درۆیان هه‌ڵبه‌ست بۆ الله، وه ده‌رباره‌ی الله بوختانیان كرد، وه له قسه‌كانیاندا كوفریان كرد).

ئه‌توانن ئه‌م نامیلكه‌یه بخوێننه‌وه بۆ زیاتر ئاشنابوون به موشه‌بیهه‌كان له‌لای سه‌له‌ف :

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/428

**١٤٤** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَقُولُ : فُلاَنٌ نَاصِبِيٌّ؛ فَاعْلَمْ أَنَّهُ رَافِضِيٌّ .

**١٤٤** - ئه‌گه‌ر گوێت له پیاوێك بوو ده‌یوت : فڵانه كه‌س ناصبیه، بزانه ئه‌وه كه‌سێكی ڕافیزه‌یه .

---

أبو حاتم و أبوزرعة ی الرازي رحمهم الله له عه‌قیده‌ی **(الرازين : ٤٤)** ئه‌ڵێن : (نیشانه‌ی ڕافیزه‌كان ئه‌وه‌یه به ئه‌هلی سوننه ده‌ڵێن ناصبة) .

**١٤٥** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَقُولُ : تَكَلَّمْ بِالتَّوحِيدِ، وَاشْرَحْ لِيَ التَّوْحِيدَ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ خَارِجِيٌّ مُعْتَزِلِيٌّ .

**١٤٥** - وه ئەگەر گوێت لێ بوو کەسێک دەیووت : دەربارەی یەکخواپەرستی قسە بکە، وە یەکخواپەرستیم بۆ ڕاڤە بکە، بزانە ئەوە کەسێکی خارجی معتزلي یە .

**١٤٦** - أَوْ يَقُولُ: فَلانٌ مُجَبَّرٌ، أَوْ يَتَكَلَّمُ بِالإِجْبَارِ، أَوْ يَتَكَلَّمُ بِالعَدْلِ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ قَدَرِيٌّ؛ لِأَنَّ هَذِهِ الْأَسْمَاءَ مُحْدَثَةٌ أَحْدَثَهَا أَهْلُ البِدْعُ .

**١٤٦** - یان دەیووت : فڵان کەس جەبریە یان قسە دەربارەی الإجبار دەکات، یان کەسەکە خۆی قسەی دەربارەی العدل دەکرد بزانە ئەوە کەسێکی قەدەرییە **[العدل : بریتیە لە نەفی قەدەر، کە ئەویش یەکێکە لە بنەماکانی موعتەزیلە]**، چونکە ئەم ناوانە داهێنراون ئەهلی بیدعە دایانهێناوە .

---

**أبو حاتم و أبو زرعة ی الرازي رحمهم الله لە عەقیدەی (الرازین : ٤٢) ئەڵێن : (نیشانەی قەدەریەکان ئەوەیە بە ئەهلی سوننە دەڵێن جەبری) .**

**حرب الكرماني رحمه الله لە كتاب السنة دا ئەڵێت :**

**١١٤ - وە هەروەها القَدَريَّة : ئەوان ئەهلی سوننە و جێگیرکردنی - سیفاتی الله تعالى - ناودەنێن : مُجبِرة .**

**قەدەرییەکانیش درۆیان کرد، بەڵکو خۆیان لەپێشترن بە درۆکردن و ناکۆکی نانەوە، نەهی قودرەتی الله تعالى دەکەن بەسەردرووستکراوەکانی، وە شتانێکیان ووت سەبارەت بە الله تعالى کە شایەنی نییە و ئەهلی ئەوە نییە .**

**١٤٧** - قَالَ عَبْدُ اللَّه بنُ المُبَارَكِ : لَا تَأَخَذُوا عَنْ أَهْلِ الكُوفَةِ فِي الرَّفْضِ شَيْئًا، وَلا عَنْ أَهْلِ الشَّامِ فِي السَّيْفِ شَيْئًا، وَلَا عَنْ أَهْلِ البَصْرَةِ فِي القَدَرِ شَيْئًا، وَلا عَنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ فِي الإِرْجَاءِ شَيْئًا، وَلَا عَنْ أَهْلِ مَكَّةَ فِي الصَّرْفِ شَيْئًا، وَلا عَنْ أَهْلِ المَدِينَةِ فِي الغِنَاءِ، وَلَا تَأْخَذُوا عَنْهُمْ فِي هَذِهِ الأَشْيَاءِ شَيْئًا .

**١٤٧** - عبدالله ی کوڕی المبارک دەڵێت : لە ئەهلی کوفە دەربارەی الرفض هیچ شتێک وەرمەگرن، وە لە ئەهلی شام دەربارەی شمشێر هیچ شتێک وەرمەگرن، وە لە ئەهلی بەصرەوە دەربارەی قەدەر هیچ شتێک وەرمەگرن، وە لە ئەهلی خۆراسانەوە هیچ شتێک دەربارەی ئیرجاء وەرمەگرن، وە لەئەهلی مەککەوە دەربارەی الصرف هیچ شتێک وەرمەگرن، لەئەهلی مەدینەوە دەربارەی گۆرانی هیچ شتێک وەرمەگرن، لەوانەوە دەربارەی ئەوشتانەی هیچ وەرمەگرن .

**١٤٨** - وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَأَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، وَأُسَيدَ بنَ الحُضَيْرِ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ سُنَّةٍ إِنْ شَاءَ اللَّه .

وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَيُّوبَ، وَابْنَ عَوْنٍ، وَيُونُسَ بنَ عُبَيْدٍ، وَعَبْدَ اللَّه بنَ إِدْرِيسَ الْأَوْدِيَّ وَالشَّعْبِيَّ، وَمَالِكَ بنَ مِغْوَلٍ، وَيَزِيدَ بْنَ زُرَيعٍ، وَمُعَاذَ بنَ مُعَاذٍ، وَوَهْبَ بنَ جَرِيرٍ، وَحَمَّادَ بنَ سَلَمَةَ، وَحَمَّادَ بنَ زَيْدٍ، وَالحَجَّاجَ مِنَ الْمِنْهَالِ، أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ، وَأَحْمَدَ بنَ نَصْرٍ، وَمَالِكَ بنَ أَنَسٍ، وَالأَوْزَاعِيَّ، وَزَائِدَةَ بِنَ قُدَامَةَ؛ فَاعْلَمْ أَنَّهُ صَاحِبُ سُنَّةٍ، وَذَكَرَهُمْ بِخَيْرٍ، وَقَالَ بِقَوْلِهِمْ .

**١٤٨** - وه ئەگەر کەسێکت بینی أبو هريرة و أنس بن مالك و أسيد بن الحضير رضي الله عنهم خۆشدەویست بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە ان شاء الله **[بیدعەچی و کافرەکان زۆر ڕقیان لە هەندێک هاوەڵی بەڕێزە چونکە ئەو فەرموودەیانەیان ڕیوایەت کردووە کە هەڵوەشێنەرەوەی بیدعەکەیانە]**، ئەگەر کەسێکت بینی أيوب و إبن عون و يونس بن عبيد و عبدالله بن إدريس الاودي و الشعبي و مالك بن مغول و يزيد بن زريع و معاذ بن معاذ و وهب بن جرير و حماد بن زيد و حماد بن سلمة و احمد بن حنبل و الحجاج بن المنهال و أحمد بن نصر و مالك بن أنس و الأوازاعي و زائدة بن قدامة خۆشدەویست بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە، وە باسیان دەکات بە چاکە و قسەکانی ئەوانی دەگووت بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە .

: ئيمام علي بن المديني له عەقیدەکەیدا ئەڵێت :

**٣٥ - وە ئەگەر کەسێکت بینی أبا هریرة رضي الله عنه خۆشدەویست، وە دوعای خێری بۆ کرد، وە ڕەحمەتی بۆ نارد، ئومێدی خێرت پێی هەبێت، بزانە ئەوە بەریئە لە بیدعە .**

**٣٦ - وە ئەگەر کەسێکت بینی عمر بن عبدالعزیزی رحمه الله خۆشدەویست، وە باسی چاکەکانی دەکرد و بڵاوی دەکردەوە، ئەوا بزانە لە پشت ئەو کارەیەوە خێر و چاکە هەیە إن شاء الله .**

**٣٧ - وە ئەگەر لە ئەهلی بەصرە کەسێکت بینی اعتماد دەخاتە سەر : أیوب السختیاني، و ابن عون، ویونس، و التیمي، وە ئەوانی خۆشویست، وە زۆر باسی کردن، وە ئیقتدائی بەوان کرد، ئەوا ئومێدی خێرت پێی هەبێت .**

**پاشان لەدوای ئەمانە :**

**حماد بن سلمة، و معاذ بن معاذ، ووهب بن جریر، چونکە بەڕاستی ئەوانە تاقیکردنەوەن بۆ سەرئەهلی بیدەع [و اتە ئەگەریەکێ ڕقی لێیان بوو دیارە کە ئەهلی سوننە نییە] .**

**٣٨ - وە ئەگەر لە ئەهلی کوفە کەسێکت بینی اعتماد دەخاتە سەر: طلحة بن مصرِّف، و أبي حیّان التیمي، و مالك بن مغول، و سفیان بن سعید الثوري، و زائدة، ئەوا ئومێدی خێرت پێی هەبێت .**

**وە لە دوای ئەوانە : عبدالله بن ادریس الأودي، و محمد بن عبید، ابن ابي عتبة، المحاربي، ئومێدی خێرت پێی هەبێت .**

**٣٩ - وە ئەگەر کەسێکت بینی ابي حنیفة ی و ڕەئیەکانی خۆشویست، وە سەیری ڕەئیەکانی کرد، ئەوا لێی دڵنیا مەبە، وە لەو کەسەی لەسەر مەزهەبەکەی ئەوە وە زیادەڕۆیی دەکات و بە ئیمانی دەزانێت .**

**١٤٩** - وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَجْلِسُ مَعَ أَهْلِ الأَهْوَاءِ فَاحْذَرْهُ، وَعَرِّفْهُ، فَإِنْ جَلَسَ مَعَهُ بَعْدَمَا عِلَمَ فَاتَّقِهِ، فَإِنَّهُ صَاحِبُ هَوَى .

**١٤٩** - وە ئەگەر کەسێکت بینی لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوواندا دادەنیشێ، ئەوە ئاگاداری بکەرەوە، وە پێی بناسێنە، جا ئەگەر لەگەڵیدا دانیشت لەدوای ئەوەی زانی، ئەوا خۆتی لێ بپارێزە، چونکە ئەوە خاوەنی ئارەزووە .

---

**: مەبەست لە (أهل الهواء) ئەو کەسانەن کە شوێن هەوا و ئارەزووەکانیان دەکەون، ئەوەی کە نەفسیان حەزیان لێیەتی، شوێنی قورئان و سونەت ناکەون و ئاوڕ لە مەنهەجی سەلەف نادەنەوە، ئەو کاتە قورئان و سونەت وەردەگرن کە لەگەڵ ئارەزووەکانیان بگونجێ ئەگینا وەریناگرن .**

**١٥٠** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ تَأْتِيهِ بِالأَثَرِ فَلَا يُرِيدُهُ، وَيُرِيدُ القُرْآنَ فَلَا تَشُكَّ أَنَّهُ رَجُلٌ قَدِ احْتَوَى عَلَى الزَّنْدَقَةِ، فَقُمْ مِن عِنْدِهِ وَدَعْهُ .

**١٥٠** - وە ئەگەر بیستت کابرایەک فەرموودەی بۆ دەهێنیتەوە کەچی نایەوێت، تەنها قورئانی دەوێت، ئەوا هیچ گومانت نەبێ ئەو کەسە زەندیقەی تێدایە، بۆیە لای ئەو هەستە و وازی لێ بهێنە .

---

**: واتە تێگەیشتنی سەلەف بۆ قورئان و فەرموودە ڕەت ئەکاتەوە و بە کەیفی خۆی تەفسیر بۆ قورئان و فەرموودە ئەکات .**

**١٥١** - وَاعْلَمْ أَنَّ الأَهْوَاءَ كُلَّهَا رَدِيَّةٌ تَدْعُو كُلُّهَا إِلَى السَّيْفِ، وَأَرْدَؤُهَا وَأَكْفَرُهَا الرَّوَافِضُ والمُعْتَزِلَةُ والجَهْمِيَّةُ، فَإِنَّهُمْ يَرُدُّونَ النَّاسَ عَلَى التَّعْطِيلِ وَالزَّنْدَقَةِ .

**١٥١** - وە بزانە هەوا و ئارەزووەکان هەمووی خراپن هەمووی دەڕۆن بەرەوڕووی شمشێر، لە هەموویان خراپتر و کوفرتر الروافض و المعتزلة و الجهمية ن جا ئەوانە خەڵکی دەبەن بەرەو پەکخستن .

---

**: ئیمام رحمه الله ڕاستی فەرموو، ئێستاش ئەشعەری و ماتوریدیەکان کە میراتگری جەهمیەکانن سیفاتەکانی الله تعالی پەکئەخەن و یەکسانی دەکەن بە هیچ .**

**١٥٢** - وَاعْلَمْ أَنَّ مَن تَنَاوَلَ أَحَدًا مِن أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ وَرَضِيَ اللَّه عَنْهُمْ فَاعْلَمْ أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ مُحَمَّدًا ﷺ، وَقَدْ آذَاهُ فِي قَبْرِهِ .

**١٥٢** - وه بزانه هەرکەسێ قسەی بە یەکێک لە هاوەڵانی محمد ﷺ ی ووت، ئەوا بزانە ئەو کەسە مەبەستی محمد ﷺ، وە ئازاری ئەوی داوە لە گۆڕەکەیدا .

**١٥٣** - وَإِذَا ظَهَرَ لَكَ مِنَ الإِنْسَانِ شَيْءٌ مِنَ البِدَعِ، فَاحْذَرْهُ، فَإِنَّ الَّذِي أَخْفَى عَنْكَ أَكْثَرُ مِمَّا أَظْهَرَ .

**١٥٣** - وە ئەگەر لە کەسێکەوە شتێک لە بیدعەت بۆ دەرکەوت، ئەوە ئاگاداری بە چونکە ئەوەی لێتی شاردووەتەوە زۆرترە لەوەی کە دەریخستووە .

**١٥٤** - وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ رَدِيءَ الطَّرِيقِ وَالمَذْهَبِ، فَاسِقًا فَاجِرًا، صَاحِبَ مَعَاصٍ ظَالِمًا وَهُوَ مِن أَهْلِ السُّنَّةِ فَاصْحَبْهُ، وَاجْلِسْ مَعَهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ تَضُرُّكَ مَعْصِيَتُهُ .

وَإِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ مُجْتَهِدًا فِي العِبَادَةِ مُتَقَشِّفًا مُحْتَرِفًا بِالعِبَادَةِ صَاحِبَ هَوَى، فَلا تَجْلِسْ مَعَهُ، وَلا تَسْمَعْ كَلامَهُ، وَلا تَمْشِ مَعَهُ فِي طَرِيقٍ، فَإِنِّي لَا آمَنُ أَنْ تَسْتَحْلِيَ طَرِيقَهُ فَتَهْلِكَ مَعَهُ .

**١٥٤** - ئەگەر کەسێکت بینی لە ئەهلی سوننە رێگا و مەزهەبی باش نەبوو، فاسق و تاوانکار بوو، خاوەنی سەرپێچی و ستەمکار بوو ئەوە هاورێیەتی بکە، وە لەگەڵیشی دابنیشە، چونکە سەرپێچی کردنەکەی زیانت پێ ناگەیەنێت، وە ئەگەر کەسێکت بینی لە خواپەرستیدا زۆر هەوڵی دەدا وازی لە دونیا هێناوە و لەناو عیبادەتدا ڕۆچووبێت بەڵام خاوەنی هەوا و ئارەزوو بوو، ئەوا لەگەڵیدا دامەنیشە، گوێ بۆ قسەکانی مەگرە، وە لە ڕێگادا لەگەڵیدا ڕێ مەکە، چونکە من دڵنیا نیم لەوەی ڕێگاکەی بە باش بزانیت، لەگەڵ ئەودا بەهەلاکەت بچیت .

**١٥٥** - وَرَأَى يُونُسُ بْنُ عُبَيْدٍ ابْنَهُ، وَقَدْ خَرَجَ مِن عِنْدِ صَاحِبِ هَوَى، فَقَالَ : يَا بُنَيَّ مِنْ أَيْنَ خَرَجْتَ؟

قَالَ : مِن عِنْدِ عَمْرِو بنِ عُبَيْدٍ .

قَالَ : يَا بُنَيَّ، لَأَنْ أَرَاكَ خَرَجْتَ مِن بَيْتِ خُنْثَى أَحَبُّ إِلَيَّ مِن أَن أَرَاكَ تَخْرُجُ مِن بَيْتِ فُلانٍ وَفُلَانٍ، وَلَأَنْ تَلْقَى اللَّه يَا بُنَيَّ زَانِيًا فَاسِقًا سَارِقًا خَائِنًا، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ تَلْقَاهُ بِقَوْلِ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ .

أَلَا تَرَى أَنَّ يُونُسَ بْنَ عُبَيْدٍ قَدْ عَلِمَ أَنَّ الخُنْثَى لَا يُضِلُّ ابْنَهُ عَنْ دِينِهِ، وَأَنَّ صَاحِبَ البِدْعَةِ يُضِلُّهُ حَتَّى يَكْفُرَه .

**١٥٥** - يونس ی كوڕی عبيد كوڕەكەی خۆی بينی لای خاوەنی هەوا و ئارەزووێكەوە دەرچوو، فەرمووی : كوڕم لە كوێ بوويت؟

وتی : لای عەمری كوڕی عبيد .

فەرمووی : كوڕم ئەگەر بتبينم لە ماڵی نێرەمووكێک دەرچيت، پێم خۆشترە لەوەی لە ماڵی فلان و فلانەوە دەرچيت، لەبەر ئەوەی كوڕەكەم ئەگەر بگەيتەوە بە الله وەک كەسێكی زيناكاری فاسقی دزی خائين، پێم خۆشترە لەوەی پێی بگەيتەوە و لەسەر قسەی ئەهلی هەوا و ئارەزووەكان بيت.

ئايە نابينی يونس ی كوڕی عبيد زانيويەتی كە كەسێكی نێرەمووک كوڕەكەی گومڕا ناكات لەدينەكەی، بەڵام خاوەنی بيدعە گومڕايی دەكات تاكو كوفر دەكات .

---

**ئيمامی مالک لە (ذم الكلام للهروي : ٨٧٤) ئەڵێت :**

**(لەعنەتی الله لە عمرو بن عبيد، چونكە ئەوئەم بيدعەيەی كەلامی داهێنا، خۆئەگەر كەلام زانست بوو ايە ئەوە هاوەڵان و تابيعيەكان قسەيان تێدا ئەكرد وەک چۆن قسەيان كردووە لە ئەحكام و شەرائيعەكان، بەڵام هيچێكە و بەرەو هيچ ئەتبات) .**

**١٥٦** - واحْذَرْ ثُمَّ احْذَرْ أَهْلَ زَمَانِكَ خَاصَّةً، وَانْظُرْ مَن تُجَالِسُ، وَمِمَّنْ تَسْمَعُ وَمَن تَصْحَبُ، فَإِنَّ الخَلْقَ كَأَنَّهُمْ فِي رِدَّةٍ إِلَّا مَن عَصَمَهُ اللَّه مِنْهُمْ .

**١٥٦** - ئاگاداربە پاشان بە تايبەتى ئاگادارى كەسانى زەمانى خۆت بە، وە سەيربكە لەگەڵ كێدا دادەنيشى، وە گوێ لە كێ دەگريت و هاوڕێيەتى كێ دەكەيت، چونكە خەڵكى هەر دەڵێى لە هەڵگەڕانەوەدان، ئيللا ئەوانە نەبێ كە الله تعالى پاراستوونى .

**١٥٧** - وَانظُر إذا سَمِعتَ الرَّجُلَ يَذْكُرُ إبن أَبِي دُوَادٍ، وَبِشْرًا المَرِّيسِيَّ، وَثُمَامَةَ، أَوْ أَبَا هُذَيْلٍ، أَوْ هِشَامًا الفُوطِيَّ، أَوْ وَاحِدًا مِن أَتْبَاعِهِمْ، وَأَشْيَاعِهِمْ، فَاحْذَرْهُ فَإِنَّهُ صَاحِبُ بِدْعَةٍ، فَإِنَّ هَؤُلاءِ كَانُوا عَلَى الرِّدَّةِ، وَاتْرُكْ هَذَا الرَّجُلَ الَّذِي ذَكَرَهُمْ بِخَيرٍ، وَمَن ذَكَرَ مِنْهُم بِمَنزِلَتِهِم .

**١٥٧** - وە سەيركە ئەگەر كەسێكت بينى بە باشە باسى : ابن ابو دؤاد و بشر المريسي و ثمامة، يان ابو هذيل، يان هشام الفوطي، يان يەكێك لە شوێنكەوتووان و جەماعەتى ئەوانى كرد، ئەوا ئاگادارى بە چونكە ئەوە خاوەنى بيدعەيە، چونكە ئەوانە هەڵگەڕانەوە بوون، واز لەو پياوە بهێنە بە باشە باسيان دەكات يان باسى يەكيك لەوان دەكات .

---

اللالكائي ئەڵێت : (إبن قتيبة له (تأويل مختلف الحديث) ئەڵێت : باسكراوه له أبو الهذيل العلاف ەوه كاتێک ئەم فەرمووده‌یەیان - و اته فەرموودەی الصادق المصدوق - بۆ گێڕایەوه له عبدالله بن مسعود ەوه رضي الله عنه وتويەتى : عبدالله بن مسعود درۆ ئەكات بەدەم پێغەمبەرەوه !

اللالكائي ئەڵێت : (أبو هذيل ی كافری ڕەتكەرەوه درۆی كرد، لەعنەتی الله ی لێبێت) .

**شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة : ٩٧٨**

**١٧٠٦** - المروذي له شوێنێكی تر ئەڵێت گوێم له أبا عبدالله (ئیمام أحمد) بوو وتی : (الله گۆڕی المريسي پڕبكات له ئاگر) .

**١٧١٧** - وكيع بن الجراح وتی : (المريسي كافره) .

**١٧١٨** - قتيبة بن سعيد وتی : (بشر المريسي ی كافر) .

**١٧١٩** - يزيد بن هارون وتی : (لێره كەسێكی لێ نییە المريسي بكوژێت؟) .

**١٧٢٠** - أبو بكر الخلاد وتی گوێم له وكيع بوو له مينا به المريسي ی وت : (ئەگەرپرسیارم لێ بكەن دەربارەی فەرمانیان پێ ئەكەم تۆبەی پێ بكەن، ئەگەر تۆبەی نەكرد خوێنی برێژن، يان بيكوژن، يان له خاچى بدەن) .

**١٧٢٢** - يزيد بن هارون وتی : (الجواربي و المريسي هەردووكيان كافرن) .

**١٧٣٥/أ** - يزيد بن هارون وتی : (بشر المريسي و أبوبكر الأصم هەردووكيان كافرن خوێنيان حەڵاڵه) .

**١٧٣٦** - يزيد بن هارون وتی : (بشر المريسي كافره به الله) .

**١٧٣٩** - الحسن بن موسى الأشيب ئەڵێت : (بشر المريسي وشعو انة ی النصر انی وەكو يەكن، هيچ جياوازيەكيان نييه تەنها ئەوه نەبێت - المريسي - نوێژ ئەكات) .

**١٧٤١** - هارون الرشيد وتى : (پێم گەیشتووە بشر المريسي ئەڵێت قورئان مخلوق ە، سوێند بە الله ئەگەر دەستم پێی بگات بە کوشتنێک ئەیکوژم تا ئێستا هیچ کەسێکم وا نەکوشتبێت) .

**١٧٤٢** - عباد بن عوام وتى : (قسەم کرد لەگەڵ المريسي و هاوەڵانی، بۆم دەرکەوت کۆتایی قسەکەیان ئەوەیە ئەڵێن ئاسمان هیچی لێ نییە) .

**١٧٤٦** - الحسن بن ثواب المخرمي ئەڵێت : وتم بە أحمد بن حنبل : إبن أبي دؤاد؟

وتى : (کافره بە الله ى العظيم) .

**١٧٤٨** - أحمد بن حنبل باسی إبن أبي دؤادی کرد وتی : (الله گۆڕەکەی پڕبکات لە ئاگر).

**كتاب السنة لـ الخلال**

الآجري رحمه الله ئەڵێت :

(ئەگەر کەسێک وتی : ئیمامی قەدەریەکان کامانەن لە مەزهەبەکانیاندا؟ پێی ئەوترێت : الله تعالى موسوڵمانانی بەرزڕاگرتووە لە مەزهەبەکانیان - واتە لە عەقیدەکەیان - ، وە ئیمامی قەدەریەکان لە مەزهەبەکانیاندا : معبد الجهني لە بەسرە، وە هاوەڵان و تابيعين ڕەددیان دایەوە وەک چۆن پێشترباسمان کرد، وە پێشترپیاوێکی ئەهلی عێراق هەبوو نەسرانی بوو، موسوڵمان بوو پاشان بوویەوە بە نەسرانی، جا معبد الجهني - عەقیدەکەی - لەوەوە وەرگرت، الأوزاعي رحمه الله وای وت، وە غیلان لە معبد ی وەرگرت، وە پێشتر باسی بەسەرهاتی غیلان مان کرد، وە باسی ئەوسەرشۆڕی وڕسو ابوونەیمان کرد کە الله لە دنیادا بۆی پێشخست، وە ئەوەی لە قیامەتدا چاوەڕێی ئەکات گەورەترە، وە باسی عمرو بن عبید و زەمکردنی ئیمامەکان بۆی و هەجر و تەکفیرکردنیمان کرد، ئەوانە ئیمامە پیس و قێزەونەکانیانن) .

**الشريعة : ٦٤٢**

**إبن بطة رحمه الله له درێژەی باسكردنی ئیمامەكانی كوفردا ئەڵێت :**

**(له سەرانی قەدەریەكان : معبد الجهني، و غيلان القدري، و ثمامة بن الأشرس، و عمرو بن عبيد، و ابو الهذيل العلاف، و ابراهيم النظام، و بشر بن المعتمر له كۆمەڵەیەكدا كه هەموویان ئەهلی كوفرو گومڕایین) .**

**الإبانة الصغرى : ٥٥٠**

**١٥٨** - وَالمِحْنَةُ فِي الإِسْلَامِ بِدْعَةٌ، وَأَمَّا اليَوْمَ فَيُمْتَحَنُ بِالسُّنَّةِ، لِقَوْلِهِ : (إِنَّ هَذَا العِلْمَ دِينٌ فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ)، لَا تَقْبَلُوا الحَدِيثَ إِلَّا مِمَّنْ تَقْبَلُونَ شَهَادَتَهُ، فَتَنْظُرَ فَإِنْ كَانَ صَاحِبَ سُنَّةٍ لَهُ مَعْرِفَةٌ صَدُوقًا كَتَبْتَ عَنْهُ وَإِلَّا تَرَكْتَهُ .

**١٥٨** - وە تاقیكردنەوەی خەڵكی لەئیسلامدا بیدعەیە، بەڵام ئەمڕۆ بە سوننەت تاقیدەكرێتەوە، لەبەر وتەی (بزانن ئەم عیلمە دینە، كەواتە سەیركەن بزانن دینەكەتان لە چ كەسێكەوە وەردەگرن)، وە فەرموودە لە هیچ كەسێكەوە وەرمەگرن ئیللا لەو كەسانەوە نەبێ كە شایەتییەكەی وەردەگیرێت، بۆیە سەیر دەكەیت ئەگەر هاتوو كەسەكە خاوەنی سوننەت بوو، شارەزا و ڕاستگۆ بوو، ئەوا فەرموودەی لێوە دەنووسم ئەگەرنا وازی لێ دەهێنرێ .

**١٥٩** - وَإِذَا أَرَدْتَ الاسْتِقَامَةَ عَلَى الحَقِّ وطَرِيقِ أَهْلِ السُّنَّةِ قَبْلَكَ، فَاحْذَرِ الكَلامَ وَأَصْحَابَ الكَلامِ وَالجِدَالَ وَالمِرَاءَ وَالْقِيَاسَ وَالمُنَاظَرَةَ فِي الدِّينِ، فَإِنَّ اسْتِمَاعَكَ مِنْهُمْ وَإِنْ لَمْ تَقْبَلْ مِنْهُمْ يَقْدَحُ الشَّكَّ فِي القَلْبِ، وَكَفَى بِهِ قَبُولا، فَتَهْلِكُ، وَمَا كَانَتْ زَنْدَقَةٌ قَطُّ، وَلَا بِدْعَةٌ، وَلَا هَوَى وَلَا ضَلَالَةٌ، إِلَّا مِنَ الكَلَامِ وَالجِدَالِ وَالمِرَاءِ وَالْقِيَاسِ، وَهِيَ أَبْوَابُ البِدْعَةِ، وَالشُّكُوكِ وَالزَّنْدَقَةِ.

**١٥٩** - ئەگەر دەتەوێت دامەزراو بیت لەسەر حەق و ڕێگای ئەهلی سوننەتی پێش خۆت، ئەوا ئاگاداری الكلام بە، وە خاوەنی الكلام و مشتومڕ و ناكۆكی و مناظره به له دیندا، چونكه گوێ گرتنت لێیان هەرچەندە لێشیان وەرنەگری ئەوا گومان و دوودڵی له دڵتدا دروست دەكات، ئەوەش بەسە بۆ قبووڵكردنی، پاشان بەهەلاكەتدا دەچیت، وە هەرگیز زەندەقە و بیدعە و ئارەزوو و گومڕایی پەیدا نەبووە ئیللا لە ڕێگای الكلام و مشتومڕ و ناكۆكی و قیاس ـەوە نەبێ، ئەویش دەرگاكانی بیدعە و گومان و زەندەقەیە.

---

: هەموو زانایانی سەلەف رحمهم الله زۆردژی الكلام و ئەهلەكەی بوون، بە خراپترین شێوە وەسفیان كردوون، وە هیچ هاوەڵێكی كەلام ناتوانیت لێی دڵنیا ببیت لەوەی تووشی كوفرو زەندەقە نەبووبێت.

**١٦٠** - فاللَّه اللَّه فِي نَفْسِكَ، وَعَلَيْكَ بِالْآثَارِ وَأَصْحَابِ الأَثَرِ وَالتَّقْلِيدِ، فَإِنَّ الدِّينَ إِنَّمَا هُوَ بِالتَّقْلِيدِ، يَعْنِي : لِلنَّبِيِّ ﷺ وَأَصْحَابِهِ رِضْوَانُ اللهِ عَلَيْهِم أَجْمَعِينَ، وَمَن قَبْلَنَا لَم يَدَعُونَا فِي لَبْسٍ فَقَلَّدْهُمْ وَاسْتَرِحْ وَلَا تُجَاوِزِ الأَثَرَ وَأَهْلَ الْأَثَرِ، وَقِفْ عِنْدَ مُتَشَابِهِ القُرْآنِ وَالْحَدِيثِ وَلَا تَقِسْ شَيْئًا، وَلَا تَطْلُبْ مِن عِنْدِكَ حِيلَةٌ تَرُدُّ بِهَا عَلَى أَهْلِ البِدَعِ، فَإِنَّكَ أُمِرْتَ بِالسُّكُوتِ عَنْهُمْ، وَلَا تُمَكِّنْهُمْ مِن نَفْسِكَ .

أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ سِيرِينَ مَعَ فَضْلِهِ لَمْ يُجِبْ رَجُلًا مِن أَهْلِ البِدَعِ فِي مَسْأَلَةٍ وَاحِدَةٍ، وَلَا سَمِعَ مِنْهُ آيَةً مِن كِتَابِ اللَّهِ ﷺ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ : أَخَافُ أَنْ يُحَرِّفَهَا فَيَقَعُ فِي قَلْبِي شَيْءٌ .

**١٦٠** - ئاگاداری نەفست بە، وە دەست بگرە بە ئەثەر و ئەهلی ئەثەر و شوێنکەوتنەوە، چونکە دین بریتییە لە شوێنکەوتن، واتە : شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی الله لێیان ڕازی بێت، وە ئەوانەی پێش ئێمە لە سەرلێشێواویدا بەجێیان نەهێشتووین، بۆیە شوێنیان بکەوە و ئاسوودەبە، وە تێمەپەڕە لە ئەثەر و ئەهلی ئەثەر، وە لە ئاستی لێکچووەکانی قورئان و فەرمووودەدا ڕاوەستە و هیچ شتێک قیاس مەکە، لە خۆتەوە بەدوای ڕێگایەکدا مەگەڕێ وەڵامدانەوەی بیدعەچیەکان، چونکە تۆ فەرمانت پێکراوە بێدەنگ بیت، زاڵیان مەکە بەسەر خۆتدا .

ئەی نازانی محمد ی کوڕی سیرین لەگەڵ ئەو هەمووی فەزڵەیدا وەڵامی پیاوێکی ئەهلی بیدعەی نەدایەوە لەیەك مەسەلەدا، وە گوێبیستی ئایەتێک

له كتێبی الله عزَّوَجَل نەبوو له ئەوەوە، پێیان گووت، ئەویش فەرمووی : لەوە دەترسم مانا حەقیقەتەكەی خۆی لابدات و له دڵمدا جێگیر بێت .

**١٦١** - وَإِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَقُولُ : إِنَّا نَحْنُ نُعَظِّمُ اللَّه إِذَا سَمِعَ آثَارَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاعْلَمْ أَنَّهُ جَهْمِيٌّ، يُرِيدُ أَنْ يَرُدَّ أَثَرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيَدْفَعَهُ بِهَذِهِ الكَلِمَةِ، وَهُوَ يَزْعُمُ أَنَّهُ يُعَظِّمُ اللَّه وَيُنَزِّهُهُ إِذَا سَمِعَ حَدِيثَ الرُّؤْيَةِ، وَحَدِيثَ النُّزُولِ، وَغَيْرَهُ، أَفَلَيْسَ قَدْ رَدَّ أَثَرَ رَسُولِ اللَّه ﷺ!

إِذَا قَالَ : إِنَّا نُعَظِّمُ اللَّه أَن يَنْزِلَ مِن مَوْضِعٍ إِلَى مَوْضِعٍ؛ فَقَدْ زَعَمَ أَنَّهُ أَعْلَمُ بِاللَّهِ مِن غَيْرِهِ، فَاحْذَرْ هَؤُلَاءِ، فَإِنَّ جُمْهُورَ النَّاسِ مِنَ السُّوقَةِ وَغَيْرِهِمْ عَلَى هَذَا الحَالِ، وَحَذِّرِ النَّاسَ مِنْهُمْ .

**١٦١** - ئەگەر گوێت له كەسێك بوو ووتی : ئێمە الله به گەورە دەزانین، كاتێ باسی فەرموودەكانی پێغەمبەری الله ﷺ ی بۆ بكرێت، ئەوا بزانە ئەو كەسە جەهمییە، دەیەوێ فەرموودەكانی پێغەمبەری الله ﷺ ڕەتبكاتەوە، له كاتێكدا ئەو بانگەشەی ئەوە دەكات كە دەیەوێ الله تعالى به گەورە بزانێ و به پاكی ڕایبگرێ كاتێك فەرموودەی بینینی الله تعالى و فەرموودەی دابەزین و جگە لەوە ببیستێ، ئایە ئەو فەرموودەكانی پێغەمبەری الله ﷺ ی ڕەت نەكردووەتەوە!

كاتێ دەڵێ : ئێمە الله تعالى بە گەورە دەزانین لەجێگایەکەوە دابەزێتەوە جێگایەکی تر، جا ئەو بانگەشەی ئەوەی کردووە ئەو شارەزاترە دەربارەی الله لە غەیری خۆی، بۆیە ئاگاداری ئەوانە بە، چونکە زۆربەی عەوامی خەڵک و جگە لەوان لەو حاڵەتەن، ئاگاداری خەڵکی بکەرەوە لێیان .

---

**: جەهمیەکان لەبەر ئەوەی بناغەی عەقیدەی خۆیان لەسەر الکلام دامەزر اندووە، وە الکلام پێچەو انەی وتەی الله تعالى و رسول ەکەیەتی، ئیتر لە بابەتی ناو و سیفاتەکانی الله عزوجل قورئان و فەرموودە قبووڵ ناکەن، وە ڕەددی ئەدەنەوە و بە تەشبیهـ و کوفری دەزانن، هەربۆیە دێن ماناکەی دەگۆڕن، و اتە تەحریفی دەکەن، ئینجا باوەڕ بەو و اتا تەحریفکراوە دەهێنن کە خۆیان بۆ ئایەت و فەرموودەکانیان کردووە، لەبەر ئەوەی کافر و زەندیقن، ئەشعەری و ماتوردیەکانیش لە سەدا سەد لەسەر عەقیدی جەهمیەکان و بگرە خر اپتریشن.**

**١٦٢** - وَإِذَا سَأَلَكَ أَحَدٌ عَنْ مَسْأَلَةٍ فِي هَذَا الكتَابِ وَهُوَ مُسْتَرْشِدٌ فَكَلِّمْهُ وَأَرْشِدْهُ، وَإِذَا جَاءَكَ يُنَاظِرُكَ؛ فَاحْذَرْهُ، فَإِنَّ فِي المُنَاظَرَةِ المِرَاءَ وَالجِدَالَ وَالمُغَالَبَةَ وَالخُصُومَةَ وَالغَضَبَ، وَقَدْ نُهِيتَ عَنْ جَمِيعِ هَذَا جِدًّا، يُخرِجَانِ جَمِيعاً مَن طَرِيقِ الحَقِّ، وَلَمْ يَبْلُغْنَا عَن أَحَدٍ مِن فُقَهَائِنَا وَعُلَمَائِنَا أَنَّهُ نَاظَرَ أَوْ جَادَلَ أَوْ خَاصَم .

**١٦٢** - ئەگەر کەسێک پرسیاری لێکردی دەربارەی ئەم بابەتە وە کەسەکەش ڕێنموویی دەویست، ئەوە قسەی لەگەڵ بکە و ڕێنموویی بکە، وە ئەگەر هات بۆ لات تاکو موناقەشەت لەگەڵ بکات، ئەوا

ئاگاداربە، چونکە لە مناظرەدا دەمەقاڵێ و مناقشە و زاڵبوون و ڕکەبەرایەتی و تورەبوون هەیە، تۆش دەربارەی ئەوانە ڕێگریت لێکراوە، ئەوەش خەڵکی لەسەر ڕێگای حەق لادەبات، وە پێمان نەگەیشتووە لە هیچ فەقیهێک لە فوقەهاکان و زانایەک لە زانایەکان هەرگیز مناظرە یان مناقشە و ڕکەبەرایەتیان کردبێت .

---

**دەتوانن ئەم نامیلکەیە بخوێننەوە بۆ زیاتر ئاشنابوون بە مەنهەجی سەلەف لەم بابەتەدا :**

https://t.me/Ktebxanay_salaf1/265

**١٦٣** - قَالَ الحَسَنُ البَصْرِيُّ : الحَكِيمُ لَا يُمَارِي وَلا يُدَارِي، حِكْمَتُهُ يَنْشُرُهَا؛ إِنْ قُبِلَتْ حَمِدَ اللَّه، وَإِنْ رُدَّتْ حَمِدَ اللَّه .

**١٦٣** - الحسن البصري دەڵێت : کەسی دانا دەمە دەمێ و تەنازول ناکات، ئەو حیکمەتەکەی خۆی بڵاو دەکاتەوە، ئەگەر وەرگیرا ئەوا سوپاسی الله دەکات، ئەگەر ڕەتکرایەوە هەر سوپاسی الله دەکات .

**١٦٤** - وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى الحَسَنِ فَقَالَ : أَنَا أُنَاظِرُكَ فِي الدِّينِ؟

فَقَالَ الحَسَنُ : أَنَا عَرَفْتُ دِينِي، فَإِنْ ضَلَّ دِينُكَ فَاذْهَبْ فَاطْلُبْهُ .

**١٦٤** - پیاوێک هاته لای الحسن بصري وتی : من موناقەشەت لەگەڵدا دەکەم لە دیندا .

الحسن وتی : من دینەکەی خۆمم زانیوە، گەر تۆ دینەکەی خۆت وونکردووە ئەوا بڕۆ بەدوایدا بگەڕێ .

**١٦٥** - وَسَمِعَ رَسُولُ اللَّه ﷺ قَوْمًا عَلَى بَابِ حُجْرَتِهِ يَقُولُ أَحَدُهُمْ : أَلَمْ يَقُلِ اللَّه كَذَا؟ وَيَقُولُ الآخَرُ : أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ كَذَا؟ فَخَرَجَ مُغْضَبًا .

فَقَالَ : (بِهَذَا أَمَرْتُكُمْ؟! أَمْ بِهَذَا بُعِثْتُ إِلَيْكُمْ ؟! أَن تَضْرِبُوا كِتَابَ اللَّه بَعْضَهُ بِبَعْضٍ؟!) فَنَهَى عَنِ الجدال .

**١٦٥** - پێغەمبەر ﷺ گوێی لە کۆمەڵێک بوو لە بەردەم ژوورەکەیدا یەکێکیان دەیوت : ئایە اللّٰه وای نەفەرمووە؟ ئەویتر دەیوت : ئایە اللّٰه وای نەفەرمووە؟

ئەویش بە تورەییەوە دەرچووە دەرەوە فەرمووی : (ئایە بەمە فەرمانم پێتان کردووە؟ یان بۆ ئەمە ڕەوانەکراوم؟ کیتابەکەی اللّٰه بەیەکتردا بدەن؟!) بۆیە نەهی جیدالی لێکردن .

**١٦٦** - وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ اللّه يَكْرَهُ الْمُنَاظَرَةَ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَمَن فَوْقَهُ، وَمَن دُونَهُ، إِلَى يَوْمِنَا هَذَا .

وَقَوْلُ اللّه أَكْبَرُ مِن قَوْلِ الخَلْقِ، قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى | **مَا يُجَادِلُ فِي ءَايَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا** | **(غافر : ٤)** .

**١٦٦** - وه إبن عمر رضي الله عنهما حەزی بە موناقەشە نەدەکرد، وە مالکی کوڕی ئەنەس و ئەوانەی سەرووی ئەو و ئەوانەی خوارەوەی ئەو تاکو ئەمڕۆ .

وتەی الله عزَّوَجَل گەورەترە لە قسەی خەڵکی، الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : | **مَا يُجَادِلُ فِي ءَايَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا** | **(غافر : ٤)** .

واتە : هیچ کەس مناقەشە و دەمە دەم ناکات لەبەرامبەری ئایەتەکانی الله ئیللا بێ باوەڕەکان نەبێت .

**١٦٧** - وَسَأَلَ رَجُلٌ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ مَا | **وَالنَّشِطَتِ نَشْطًا** | **(النازعات : ٢)**

فَقَالَ : لَوْ كُنْتَ مَحْلُوقًا، لَضَرَبْتُ عُنُقَكَ .

**١٦٧** - پیاوێک پرسیاری کرد لە عومەری کوڕی خطاب رضي الله عنه وتی : | **وَالنَّشِطَتِ نَشْطًا** | چییە؟

فەرمووی : ئەگەر سەرت تاشراو بوایە ئەوا لە گەردەنتم دەدا .

: لە عادەتی خەواریجەکان بریتی بووە لە پرسیارکردن دەربارەی موتەشابیهەکانی قورئان و سەرسفرکردن .

١٦٨ - وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (المُؤْمِنُ لَا يُمَارِي، وَلَا أَشْفَعُ لِلْمُمَارِي يَوْمَ القِيَامَةِ، فَدَعُوا المِرَاءَ لِقِلَّةِ خَيْرِهِ) .

١٦٨ - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (کەسی ئیماندار دەمەدەمێ ناکات، وە شەفاعەتی بۆ دەمەدەمێکار ناکەم لە ڕۆژی قیامەتدا، بۆیە واز لە مشتومڕ بێنە لەبەر کەمی خێرەکەی) .

١٦٩ - وَلَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَن يَقُولَ : فَلَانٌ صَاحِبُ سُنَّةٍ، حَتَّى يَعْلَمَ مِنْهُ أَنَّهُ قَدِ اجْتَمَعَتْ فِيهِ خِصَالُ السُّنَّةِ، لَا يُقَالُ لَهُ صَاحِبُ سُنَّةٍ حَتَّى تَجْتَمِعَ فِيهِ السُّنَّةُ كُلُّهَا .

١٦٩ - حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێکی موسڵمان بڵێت : فڵان کەس ئەهلی سوننەیە ، تاکو نەزانێ تایبەتمەندیەکانی سوننەتی تێداکۆبووتەوە، پێی ناوترێت ئەهلی سوننەت تاکو هەموو سوننەتی لا کۆ نەبێتەوە .

**١٧٠** - قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بنُ المُبَارَكِ : أَصْلُ اثْنَيْنِ وَسَبْعِينَ هَوَى أَرْبَعَةُ أَهْوَاءٍ، فَمِنْ هَذِهِ الْأَرْبَعَةِ أَهْوَاءٍ تَشَعَبَت الاثْنَانِ وَسَبْعُونَ هَوَى : القَدَرِيَّةُ، وَالمُرْجِئَّةُ، وَالشَّيعَةُ، وَالخَوَارِجُ .

**١٧٠** - وە عبدالله ی کوڕی المبارك دەڵێت : بنەمای حەفتا و دوو ئارەزووکە چوار ئارەزووە، جا لەم چوار ئارەزووەوە حەفتا و دوو ئارەزووەکەی لێ بووەتەوە : قەدەریەکان و مورجیئەکان و شیعەکان و خەواریجەکان .

**١٧١** - فَمَن قَدَّمَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيًّا عَلَى جَمِيعِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَلَمْ يَتَكَلَّمْ فِي البَاقِينَ إِلَّا بِخَيْرٍ وَدَعَا لَهُمْ، فَقَدْ خَرَجَ مِنَ التَّشَيُّعِ أَوَّلِهِ وَآخِرِه.

**١٧١** - جا هەر کەسێک ئەبو بەکر و عومەر و عثمان و علي پێشخست بەسەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ و قسەی بە ئەوانیتر نەگووت ئیللا بە چاکە نەبێ و دوعای بۆ کردن، ئەوا لە سەرەتا و کۆتایی شیعەبوون دەردەچێت .

---

**: یەکەم هەنگاوی شیعەکان بۆ دوورکەوتنەوە لە سوننەت لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە وتیان ئێمە علي پێشناخەین بەسەر عثمان دا رضي الله عنهم، وە ئێستاش گەیشتوون بەو**

**كوفرو شيرک وزەندەقەيەى ئە دەيبينن، دينەكەيان هيچ جياوازى نييە لە دينى مانگا و مشک پەرستان .**

**١٧٢** - وَمَن قَالَ : الإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ؛ فَقَدْ خَرَجَ مِنَ الْإِرْجَاءِ كُلِّهِ أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ .

**١٧٢** - هەركەسێك بڵێ : ئيمان وتە و كردەوەيە زياد دەكات و كەم دەكات دەكات، ئەوا لە سەرەتا و كۆتايى ئيرجاء دەچێتە دەرەوە .

**١٧٣** - وَمَن قَالَ : الصَّلَاةُ خَلْفَ كُلِّ بَر وَفَاجِرٍ، وَالجِهَادُ مَعَ كُلِّ خَلِيفَةٍ، وَلَمْ يَرَ الخُرُوجَ عَلَى السُّلْطَانِ بِالسَّيْفِ، وَدَعَا لَهُمْ بِالصَّلَاحِ، فَقَدْ خَرَجَ مِن قَوْلِ الخَوَارِجِ أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ .

**١٧٣** - هەركەسێك بڵێ : نوێژكردن لە پشت هەموو چاك و خراپێكەوە دروستە و جيهاد لەگەڵ هەموو خەليفەيەكدا، دەرچوون بە ڕەوا نابينێ لە دژى سوڵتان بە شمشێر، وە دوعاى چاكسازييان بۆ دەكات ئەوا لە سەرەتا و كۆتايى قسەى خەواريج دێتە دەرەوە .

**١٧٤** - وَمَن قَالَ : المَقَادِيرُ كُلُّهَا مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، خَيْرُهَا وَشَرُّهَا، يُضِلُّ مَن يَشَاءُ، وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ فَقَدْ خَرَجَ مِن قَوْلِ القَدَرِيَّةِ أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ، وَهُوَ صَاحِبُ سُنَّةٍ.

**١٧٤** - هەرکەسێك بڵێ : قەدەرەکان هەموو لە الله وەیە، بە چاکە و خراپە، هەرکەسێ ویستی لێ بێت ئەوا گومڕایی دەکات و هەرکەسێ ویستی لێ بێت ئەوا هیدایەتی دەدا ئەوا لە سەرەتا و کۆتایی قسەی قەدەریەکان، وە ئەهلی سوننەیە .

**١٧٥** - وَبِدْعَةٌ ظَهَرَتْ هِيَ كُفْرٌ بِاللَّهِ العَظِيمِ، وَمَن قَالَ بِهَا فَهُوَ كَافِرٌ بِاللَّهِ لَا شَكَّ فِيهِ، مَن يُؤْمِنُ بِالرَّجْعَةِ، وَيَقُولُ : عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حَيٌّ، وَسَيَرْجِعُ قَبْلَ يَوْمِ القِيَامَةِ، وَمُحَمَّدُ بنُ عَلِيٍّ، وَجَعْفَرُ بنُ مُحَمَّدٍ، وَمُوسَى بْنُ جَعْفَرٍ، وَيتكَلَّمُونَ فِي الإمَامَة، وَأَنَّهُمْ يَعْلَمُونَ الغَيْبَ. فَاحْذَرْهُمْ فَإِنَّهُمْ كُفَّارٌ بِاللَّه العَظِيمِ، وَمَن قَالَ بِهَذَا القَوْلِ .

**١٧٥** - وە بیدعەیەك پەیدا بوو ئەویش کوفرە بە الله تعالى، وە هەر کەسێکیش وا بڵێ ئەوا کافرە و هیچ گومانی تێدا نییە، هەر کەسێك باوەڕی بە گەڕانەوە هەبێت، وە دەڵێن : علي کوڕی أبي طالب رضي الله عنه زیندووە، وە دەگەڕێتەوە پێش ڕۆژی قیامەت، وە محمدی کوڕی علي و جعفری کوڕی محمد و موسى ى کوڕی جعفر [واتە پێیان وایە ئەمانە دەگەڕێنەوە پێش

**ڕۆژی قیامەت]**، وە دەربارەی پێشەوایەتی قسە دەکەن، وە باوەڕیان وایە کە علمی غەیب دەزانن، ئاگاداریان بە، بەڕاستی ئەمانە کافرن بە الله تعالى، وە ئەوەیشی ئەو قسەیە دەکات .

**١٧٦** - قَالَ طُعْمَةُ بنُ عَمْرٍو وَسُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ رَحِمَهُمَا اللَّه : مَن وَقَفَ عِنْدَ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ، فَهُوَ شِيعِيٌّ، لا يُعَدَّلُ، وَلا يُكَلَّمُ، وَلَا يُجَالَسُ، وَمَن قَدَّمَ عَلِيًّا عَلَى عُثْمَانَ فَهُوَ رَافِضِيٌّ، قَدْ رَفَضَ آثَارَ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، وَمَن قَدَّمَ الأَرْبَعَةَ عَلَى جَمِيعِهِمْ، وَتَرَحْم عَلَى البَاقِينَ وَكَفَّ عَنْ زَلَلِهِمْ، فَهُوَ عَلَى طَرِيقِ الاسْتِقَامَةِ وَالهُدَى فِي هَذَا البَابِ .

**١٧٦** - طعمة ی کوڕی عمرو و سفیانی کوڕی عیینة ڕەحمەتی الله بیان لێ بێ دەڵێن : هەر کەسێک لە عثمان و عەلیدا وەستا **[واتە وتی هیچکامیان پێشناخەم بەسەر ئەوی تردا]**، ئەوا شیعەیە، نابێ تەعدیل بکرێت **[واتە حوکم نادرێت بە عەدالەت بوونی]**، وە نابێ قسەی لەگەڵدا بکرێ، وە نابێ لەگەڵیدا دانیشی، وە هەر کەسێک علي پێش عثمان خست ئەوا رافیضەیە، چونکە ئاثارەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری الله ﷺ ی ڕەتکردووتەوە، هەر کەسێک ئەو چوارەی پێش هەموویان خست **[واتە چوار پێشەواکە : ابو بكر الصديق، عمر بن الخطاب، عثمان بن العفان، علي بن ابي طالب، رضي الله عنهم اجمعين]**، وە ڕەحمەتی بۆ

ئەوانی تر نارد، وە وازی لە باسکردنی هەڵەکانیان هێنا، ئەوا لەسەر ڕێگای سەقامگیریی و هیدایەتە لەم باسەدا .

**١٧٧** - وَالسُّنَّةُ أَن تَشْهَدَ أَنَّ العَشَرَةَ الَّذِينَ شَهِدَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّه ﷺ بِالجَنَّةِ أَنَّهُمْ مِن أَهْلِ الجَنَّةِ لَا شَكٍّ فِيهِ، وَلَا تُفْرِدْ بِالصَّلَاةِ عَلَى أَحَدٍ إِلَّا لِرَسُولِ اللَّه ﷺ وَعَلَى آلِهِ فَقَطْ .

**١٧٧** - وە لە سوننەتە شایەتی بدەیت بۆ ئەو دە کەسەی کە پێغەمبەری اللە ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ داون، ئەوان لە ئەهلی بەهەشتن بەبێ هیچ گومانێک، وە هیچ کەسێك تایبەتمەند مەکە بە صەڵاوات دان تەنها پێغەمبەری اللە ﷺ و بنەماڵەی پێغەمبەر نەبێت ﷺ .

---

**: دە مژدە پێدراوەکە بریتین لە : ابوبکر و عمر و عثمان و علي و طلحة بن عبيد الله و الزبير بن العوام و سعد بن ابي وقاص و سعيد بن زيد بن عمرو بن نفيل و عبدالرحمن بن عوف و أبو عبيدة الجراح رضي الله عنهم جميعا .**

**١٧٨** - وَتَعْلَمُ أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قُتِلَ مَظْلُومًا، وَمَن قَتَلَهُ كَانَ ظَالِمًا .

**١٧٨** - وه بزانه عثمانی کوڕی عفّان رضي الله عنه به ستەم لێکراوی کوژرا و ئەوەی کوشتی ستەمکارە .

**١٧٩** - فَمَن أَقَرَّ بِمَا فِي هَذَا الكِتَابِ وَآمَنَ بِهِ وَاتَّخَذَهُ إِمَامًا، وَلَمْ يَشُكَّ فِي حَرْفٍ مِنْهُ، وَلَمْ يَجْحَدْ حَرْفًا وَاحِدًا؛ فَهُوَ صَاحِبُ سُنَّةٍ وَجَمَاعَةٍ، كَامِلٌ قَدِ اكْتَمَلَتْ فِيهِ الجَمَاعَةُ، وَمَن جَحَدَ حَرْفًا مِمَّا فِي هَذَا الكِتَابِ، أَوْ شَكَّ فِي حَرْفٍ مِنْهُ، أَوْ شَكَّ أَوْ وَقَفَ، فَهُوَ صَاحِبُ هَوَى، وَمَن جَحَدَ أَوْ شَكَّ فِي حَرْفٍ مِنَ القُرْآنِ أَوْ فِي شَيْءٍ جَاءَ عَن رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى مُكَذِّبًا، فَاتَّقِ اللَّهَ وَاحْذَرْ وَتَعَاهَدْ إِيمَانَكَ .

**١٧٩** - وه هەرکەسێك دان بەوەدا بنێت لەم کتێبەدا هەیە و بڕوای پێ هێنابێت و بیکاتە پێشەنگی خۆی و لە یەك پیتدا گومانی نەبێ، وە نکۆڵی لە یەك پیتی نەکات، ئەوا خاوەنی سوننەت و جەماعەتە، بە تەواوی جەماعەتی تێدا کامل بووە، هەر کەسێك نکۆڵی لە پیتێك بکات لەوەی لەم کتێبەدا هەیە، یان گومانی لە پیتێکی هەبێت، یان گومانی بوو وەستا، ئەوا خاوەنی هەوا و ئارەزووە، وە هەر کەسێک نکۆڵی یان گومانی هەبێت لە پیتێک لە قورئان، یان لە شتێک لە پێغەمبەری الله وە ﷺ هاتبێ، ئەوا دەگاتە الله تعالى

وەکو کەسێکی بەدرۆخەرەوە، بۆیە لە الله بترسە و وریابە دەست بە ئیمانەکەتەوە بگرە .

**١٨٠** - وَمِنَ السُّنَّةِ أَلَا تُطِيعَ أَحَدًا فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، وَلَا الوَالِدَيْنِ وَالخَلْقَ أَجْمَعِينَ، لا طَاعَةَ لِبَشَرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، وَلا يُحِبُّ عَلَيْهِ أَحَدًا، وَاكْرَه ذَلِكَ كُلَّهُ لِلّهِ تَبَارِكَ وَتَعَالَى .

**١٨٠** - وە لە سوننەتدایە کە نابێ گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بکرێت لە سەرپێچی الله دا، نە دایک و نە باوک، وە نە هەموو خەڵکی، گوێڕایەڵی هیچ مرۆڤێك نابێ بکرێت لەسەرپێچی الله دا، وە لەسەرپێچیدا هیچ کەسێکت خۆشنەوێ، وە ڕقت لە هەموو ئەوانە بێ لەپێناو الله تعالى .

**١٨١** - وَالإِيمَانُ بِأَنَّ التَّوْبَةَ فَرِيضَةٌ عَلَى العِبَادِ، أَنْ يَتُوبُوا إِلَى اللَّه عَزَّ وَجَلَّ مِن كَبِيرِ المَعَاصِي وَصَغِيرِهَا .

**١٨١** - وە باوەڕ بەوەی تەوبە فەرزە لەسەر بەندەکان، دەبێ تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای الله عزَّوَجَل، لە تاوانە گەورەکان و بچووکەکان.

**١٨٢** - وَمَنْ لَمْ يَشْهَدْ لِمَنْ شَهِدَ لَهُ رَسُولُ اللَّه ﷺ بِالجَنَّةِ؛ فَهُوَ صَاحِبُ بِدْعَةٍ، وَضَلالَةٍ، شَاكٌّ فِيمَا قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ .

**١٨٢** - وه هەر كەسێك شايەتی نەدات بەو كەسەی پێغەمبەری الله ﷺ شايەتی بەهەشتی بۆ دابێ، ئەوا كەسێكی خاوەن بيدعە و گومڕاييە، گومانی هەيە لەوەی پێغەمبەری الله ﷺ فەرموويەتی .

**١٨٣** - قَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ : مَن لَزِمَ السُّنَّةَ وَسَلِمَ مِنْهُ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّه ﷺ ثُمَّ مَاتَ، كَانَ مَعَ النَّبِيّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ، وَإِن كَانَ لَهُ تَقْصِيرٌ فِي العَمَلِ .

**١٨٣** - ماليكی كوڕی ئەنەس دەڵێت : (هەر كەسێك دەست بگرێت بە سوننەتەوە، وە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لێی سەلامەت بن و ئينجا بمرێت ئەوا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆيان و شەهيدان و پياوچاكانداية، هەر چەندە كەمتەرخەمی هەبێت لە كردەوەكانيدا .

---

**: ئەمە فەزڵی ئەوكەسە دەردەخات كە عەقيدەی ئەهلی سوننە و جەماعەتی هەيە و دەستی گرتووە بە سوننەتەوە، بەڵام ئەمە وامان لێ نەكات كە ساردمان بكاتەوە و تەمبەڵی ڕوومان تێ بكات بەڵكو ئەبێت بەردەوام لە نێوان ڕەجا و ترس و خۆشەويستی الله وە عيبادەتەكان بكەين و دوعا بكەين بۆ هيدايەت و ثبات .**

**١٨٤** - وَقَالَ بِشْرُ بنُ الحَارِثِ : السُّنَّةُ هِيَ الإِسْلَامُ، وَالإِسْلَامُ هُوَ السنة .

**١٨٤** - وه بشرى كورِى الحارث دهڵێت : (ئيسلام بريتييه له سوننهت، وه سوننهتيش بريتييه له ئيسلام) .

---

**: واته هەردووكيان پێكەوه گرێدراون و تەواوكەرى يەكترين و هيچكاميان بەبێ ئەوەى تريان نابێت .**

**١٨٥** - وَقَالَ فُضَيلُ بْنُ عِيَاضٍ : إِذَا رَأَيْتَ رَجُلًا مِن أَهْلِ السُّنَّةِ فَكَأَنَّمَا أَرَى رَجُلًا مِن أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، وَإِذَا رَأَيْتُ رَجُلًا مِن أَهْلِ البِدَعِ فَكَأَنَّمَا أَرَى رَجُلًا مِنَ الْمُنَافِقِينَ .

**١٨٥** - وه فضيل ى كورِى عياض دهڵێت : (ئهگهر كهسێك ببينم له ئههلى سوننهت وهكو ئهوهيه كهسێكم بينيبێ له هاوهڵانى پێغهمبهر ﷺ، وه ئهگهر كهسێك ببينم له ئههلى بيدعه وهكو ئهوه وايه كهسێكم بينيبێ له دووڕووهكان) .

**١٨٦** - وَقَالَ يُونُسُ بْنُ عُبَيْدٍ : العَجَبُ مِمَّنْ يَدْعُو اليَوْمَ إِلَى السُّنَّةِ، وَأَعْجَبُ مِنْهُ المُجِيبُ إِلَى السُّنَّةِ .

**١٨٦** - وە يونس ی کوڕی عُبيد دەڵێت : (سەيرە كەسێك ئەمڕۆ بانگەوازی دەکات بۆ سوننەت وە لەوە سەيرتر ئەوەيە كەسێک وەڵامی سوننەت دەداتەوە و قبوڵی دەکات) **[بەهۆی زۆری بيدعە و فيتنە، وە كەمی ئەهلی سوننە و جماعە، والله المستعان]** .

**١٨٧** - وَكَانَ ابْنُ عَوْنٍ يَقُولُ عِنْدَ المَوْتِ : السُّنَّةَ السُّنَّةَ، وَإِيَّاكُمْ وَالبِدَعَ حَتَّى مَاتَ .

**١٨٧** - وە إبن عون لە کاتی مردن دەيوت : (دەست بگرن بەسوننەت، دەست بگرن بە سوننەت، وە دووربکەونەوە لە بيدعە) تاکو مرد .

**١٨٨** - وَقَالَ أَحْمَدُ بنُ حَنْبَلٍ : مَاتَ رَجُلٌ مِن أَصْحَابِي، فَرُئِيَ فِي المَنَامِ، فَقَالَ : قُولُوا لأَبِي عَبْدِ اللَّه : عَلَيْكَ بِالسُّنَّةِ فَإِنَّ أَوَّلَ مَا سَأَلَنِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ عَنِ السُّنَّةِ .

**١٨٨** - وە أحمد بن حنبل دەڵێت : (يەکێك لە هاوەڵانم مرد، لە خەودا بينرابوو، جا وتبووی : بە باوکی عبدالله بڵێن : دەست بە سوننەتەوە بگرێت،

چونکە یەکەم شت کە الله تعالی پرسیاری لێکردم دەربارەی سوننەت بوو).

**١٨٩** - وَقَالَ أَبُو العَالِيَةِ : مَن مَاتَ عَلَى السُّنَّةِ مَسْتُورًا فَهُوَ صِدِّيقُ .

ويقال : الاعْتِصَامُ بِالسُّنَّةِ نَجَاةٌ .

**١٨٩** - وە أبو العالية دەڵێت : (هەرکەسێك لەسەر سوننەت بمرێت و هیچ جیاوازیەکی لێ نەبینرێ، ئەوا کەسێکی ڕاستگۆیە .

وە دەوترێت دەست گرتن بە سوننەت ڕزگاربوونە **[واتە ڕزگاربوونە لە ئاگرو سەلامەتە لە هەموو بیدعەیەك]** ) .

**١٩٠** - وَقَالَ سُفْيَانُ الثَّورِيُّ : مَن أَصْغَى بِأُذُنِهِ إِلَى صَاحِبِ بِدْعَةٍ خَرَجَ من عِصْمَةِ اللَّه، وَوُكِلَ إِلَيْهَا يَعْنِي : إِلَى البِدَعِ .

**١٩٠** - وە سفیانی الثوري وتوویەتی : (هەر کەسێك بە گوێیەکانی گوێ بۆ خاوەنی بیدعە بگرێت، ئەوا لە پارێزراوی الله تعالی دەردەچێت و بەوەوە دەسپێردرێ واتە بە بیدعەکە **[مانای وایە لە پارێزراوی الله تعالی دەردەچێت و دەسپێردرێ بە بیدعەچیەکە چونکە خۆی گوێی بۆ بیدعەچی سووك کردووە و گوێی بۆ ڕادەگرێت]** ) .

١٩١ - وَقَالَ دَاوُدُ بنُ أَبِي هِنْدِ : أَوْحَى اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى مُوسَى بنِ عِمْرَانَ عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ: لا تُجَالِسُ أَهْلَ البِدَعِ، فَإِنْ جَالَسْتَهُمْ فَحَاكَ فِي صَدْرِكَ شَيْءٌ مِمَّا يَقُولُونَ أُكْبِبْتَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ .

١٩١ - وه داود بن أبي هند وتوويەتی : (الله تبارك وتعالى وەحی كرد بۆ موسی كوڕی عیمران عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ : لەگەڵ بیدعەكاران دامەنیشە، ئەگەر لەگەڵیاندا دانیشتی و شتێك بە دڵتەوە بنووسێت لەوەی كە دەیڵێن ئەوا بە سەردا دەخرێیتە ناو ئاگری جەهەننەمەوە) .

١٩٢ - وَقَالَ الفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : مَنْ جَالَسَ صَاحِبَ بِدْعَةٍ لَمْ يُعْطَ الحِكْمَةَ .

١٩٢ - وه فضيل ی كوڕی عیاض وتوویەتی : (هەر كەسێك لەگەڵ خاوەن بیدعەیەكدا دابنیشێ ئەوا چیتر حیكمەتی پێ نابەخشرێ) .

١٩٣ - وَقَالَ الفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : لَا تَجْلِسْ مَعَ صَاحِبِ بِدْعَةٍ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ تَنْزِلَ عَلَيْكَ اللَّعْنَةُ .

١٩٣ - وه فضيل ی كوڕی عیاض وتوویەتی : (لەگەڵ خاوەن بیدعەدا دامەنیشە، چونكە لەوە دەترسم لەعنەتت بەسەردا دابارێت) .

**١٩٤** - وَقَالَ الفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : مَن أَحَبَّ صَاحِبَ بِدْعَةٍ أَحْبَطَ اللَّهُ عَمَلَهُ، وَأَخْرَجَ نُورَ الإِسْلَامِ مِن قَلْبِهِ .

**١٩٤** - وه فضيل ی كوڕی عياض وتوويەتی : (هەر كەسێك خاوەنی بیدعەی خۆشبوێت، ئەوا الله تعالى كارەكەی پووچەڵ دەكاتەوە و ڕووناكی ئیسلام لە دڵی دەردەكات) .

**١٩٥** - وَقَالَ الفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : مَن جَلَسَ مَعَ صاحِب بِدعَةً وَرَّثَهُ العَمى.

**١٩٥** - وه فضيل ی كوڕی عياض وتوويەتی : (هەر كەسێك لەگەڵ خاوەن بیدعەدا دابنیشێت ئەوە كوێری [دڵی] بۆ دەمێنێتەوە) .

**١٩٦** - وَقَالَ الفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : مَن جَلَسَ مَعَ صَاحِبِ بِدْعَةٍ فِي طَرِيقٍ، فَجُزْ فِي طَرِيقٍ غَيْرِهِ .

**١٩٦** - وه فضيل ی كوڕی عياض وتوويەتی : (هەركەسێ لەگەڵ خاوەنی بیدعەدا دانیشێت ئەوا لەڕێگایەكی ترەوە بڕۆ **[واتە گەر لەڕێگا ئەوت بینی ئەوا لەگەڵیدا مەڕۆ لەڕێگایەكی ترەوە بڕۆ، وە هاوڕێیەتیان مەكە چونكە كارت تێدەكەن]** ) .

**١٩٧** - وَقَالَ الفُضَيْلُ بنُ عِيَاضٍ : مَن عَظَّمَ صَاحِبَ بِدْعَةٍ فَقَدْ أَعَانَ عَلَى هَدْمِ الإسلامِ، وَمَنْ تَبَسَّمَ فِي وَجْهِ مُبْتَدِعٍ؛ فَقَدِ اسْتَخَفَّ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ، وَمَن زَوَّجَ كَرِيمَتَهُ مِنْ مُبْتَدِعًا فَقَدْ قَطَعَ رَحِمَهَا، وَمَن تَبِعَ جَنَازَةَ مُبْتَدِعٍ لَم يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّه حَتَّى يَرْجِعَ .

**١٩٧** - وه فضيل ى كوڕى عياض وتوويەتى : (هەركەسێك بيدعەچييەك بە گەورە بزانێت ئەوا يارمەتى دەدات بۆ ڕووخانى ئيسلام، هەركەسێك بە ڕووى مبتدع يێكدا پێبكەنێ ئەوا بە سووك تەماشاى ئەوەى كردووە دابەزيوەتە سەر محمد ﷺ دا، هەركەسێك كچەكەى خۆى دا بە متبدعێك ئەوا پەيوەندى خزمايەتييەكەى پچڕاندووە، هەركەسێك شوێن جەنازەى مبتدعێك بكەوێ ئەوا بەردەوام لەژێر تووڕەبوونى الله دايە تاكو دەگەڕێتەوە) .

**١٩٨** - وَقَالَ الفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ : أَكُلُ مَعَ يَهُودِي وَنَصْرَانِي وَلَا أَكُلُ مَعَ مُبْتَدِعٍ، وَأُحِبُّ أَن يَكُونَ بَيْنِي وَبَيْنَ صَاحِبِ بِدْعَةٍ حِصْنٌ مِن حَدِيدٍ .

**١٩٨** - وه فضيل ى كوڕى عياض وتوويەتى : (لەگەڵ جولەكە و گاوردا نان دەخۆم بەڵام لەگەڵ مبتدع دا ناخۆم، پێم خۆشە لە نێوان من خاوەن بيدعە قەڵايەكى ئاسنين هەبێت) .

**١٩٩** - وَقَالَ الفُضَيلُ بْنُ عِيَاضٍ رَحَمَهُ اللَّهُ : إِذَا عَلِمَ اللَّهُ مِنَ الرَّجُلِ أَنَّهُ مُبْغِضٌ لِصَاحِبِ بِدْعَةٍ؛ غَفَرَ لَهُ، وَإِن قَلَّ عَمَلُهُ .

وَلا يَكُنْ صَاحِبُ سُنَّةٍ يُمَالِئُ صَاحِبَ بِدْعَةٍ إِلَّا نِفَاقًا .

وَمَن أَعْرَضَ بِوَجْهِهِ عَنْ صَاحِبِ بِدْعَةٍ، مَلأَ اللَّهُ قَلْبَهُ إِيمَانًا .

وَمَنِ انْتَهَرَ صَاحِبَ بِدْعَةِ آمَنَهُ اللَّهُ يَوْمَ الفَزَعِ الأَكْبَرِ .

وَمَن أَهَانَ صَاحِبَ بِدْعَةٍ، رَفَعَهُ اللَّهُ فِي الجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ .

فَلَا تَكُنْ صَاحِبَ بِدْعَةٍ فِي اللَّه أَبَدًا . انتهى .

**١٩٩** - وه فضيل ی كوڕی عیاض رحمه الله وتوویه‌تی : (ئه‌گه‌ر الله تعالى زانی كه‌سێك ڕقی له خاوه‌ن بیدعه‌یه ئه‌وا لێی خۆش ده‌بێ، هه‌ر چه‌نده كرده‌وه‌كانی كه‌م بێت .

كه‌سێكی خاوه‌ن سوننه‌ت لایه‌نگیری خاوه‌ن بیدعه ناكات ئیللا دووڕوویيه .

هه‌ركه‌سێك ڕووی له‌خاون بیدعه وه‌رگێڕێ ئه‌وا الله تعالى دڵی پڕ ده‌كات له ئیمان .

هه‌ر كه‌سێك توڕه‌بێت له خاوه‌ن بیدع ئه‌وا الله تعالى له ڕۆژی قیامه‌ت دڵنیا و بێ ترسی ده‌كات .

هەر کەسێك خاوەن بیدعەیەك ڕیسوا بكات ئەوا الله تعالى لەبەهەشتدا سەد پلە بەرزی دەكاتەوە

بۆیە لەبەر الله هەرگیز خاوەنی بیدعە مەبە) .

**اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً، وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِكَ خَالِصَاً، وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً**

**https://t.me/KitabSalaff**

وە بزانە ڕەحمەتی اللە ـت
لێ بێت کە وا عیلم بە زۆریی
کتێب و ڕیوایەتکردن نییە،
بەڵکو زانا ئەو کەسەیە
شوێنی عیلم و سوننەتەکان
دەکەوێت هەرچەندە عیلم و
کتێبی کەم بێت، هەر
کەسێک پێچەوانەی کیتاب و
سوننەت بێت ئەوە بیدعە
چییە، هەرچەندە زانست و
کتێبیشی زۆر بێت .